زنجیرەی پەیامی ڕێگای ڕاست (٤٣)

# چیرۆکەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ

# و

# پەندو ئامۆژگاری وەرگرتن لێیان


ئامادەکردن و وەرگێڕانی

م. ابوبکر احمد قادر

پێداچوونەوەی

م. صلاح الدین عبدالکریم



منتدى اقرأ الثقافي
www.iqra.ahlamontada.com

زنجیره ڕێنماییەکانی ڕێگای ڕاست (٤٣)

# چیرۆکەکانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)

# و

# پەندو ئامۆژگاری وەرگرتن لێیان

ئامادەکردن و وەرگێڕانی
مامۆستا: أبوبكر أحمد

چاپی سێیەم
١٤٣١ کۆچی - ٢٠١٠ زایینی

## پێناسەی پەرتووک

**ناوی پەرتووک:** چیرۆکەکانی پێغەمبەری خوا(ﷺ)و پەندو ئامۆژگاری وەرگرتن لێیان.

**ئامادەکردنی:** مامۆستا أبوبکر أحمد

**زنجیرە:** زنجیرەی (٤٣) لە زنجیرە ڕێنماییەکانی ڕێگای ڕاست.

**ساڵی چاپ:** ١٤٣١ کۆچی ـ ٢٠١٠ زایینی.

**نۆبەتی چاپ:** چاپی سێیەم.

**شوێنی چاپ:** چاپخانەی سیڤا/ سلێمانی

**بنکەی بڵاوکردنەوە:** کتێبخانەی سیما/چەمچەماڵ ☎.(٠٧٧٠١٢٣٦٠٨٩)

**ژمارەی سپاردن:** ژمارە(٣٤٦)ی پێ دراوە لە لایەن وەزارەتی ڕۆشنبیرییەوە.

**تیراژ:** (١٠٠٠).

**بنکەی بڵاوکردنەوە:**

کتێبخانەی سوننە — سلێمانی

کتێبخانەی سیما — چەمچەماڵ

کتێبخانەی زانست — کەلار

✍. مافی چاپکردن و لەبەرگرتنەوەی پارێزراوە.

## پێشەکی

إنَّ الْحَمْدَ للَّه نَحْمَدُهُ وَنَسْتَعِينُهُ وَنَسْتَغْفِرُهُ وَنَعُوذُ باللَّه منْ شُرُورِ أَنْفُسنَا وَسَيِّئَات أَعْمَالنَا مَنْ يَهْده اللَّهُ فَلاَ مُضلَّ لَهُ وَمَنْ يُضْللْ فَلاَ هَاديَ لَهُ وَأَشْهَدُ أَنْ لاَ إلَهَ إلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴿١٠٢﴾﴾ سورة آل عمران

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَآءً ۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلْأَرْحَامَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا ﴿١﴾﴾ سورة النساء

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوْلًا سَدِيدًا ﴿٧٠﴾﴾ سورة الأحزاب

أَمَّا بَعْدُ...فَإِنَّ أَصْدَقَ الْحَديث كتَابُ اللَّه وَأَحْسَنَ الْهَدْيِ هَدْيُ مُحَمَّد(ﷺ) وَشَرَّ الأُمُورِ مُحْدَثَاتُهَا وَكُلَّ مُحْدَثَة بدْعَةٌ وَكُلَّ بدْعَة ضَلاَلَةٌ وَكُلَّ ضَلاَلَة فِي النَّارِ.

**باوەڕداری خۆشەویست:** بێگومان مرۆڤەکان حەزیان لە چیرۆکو بەسەرهاتە، وە کاریگەری هەیە لەسەر دەروونی مرۆڤ، وە هۆکاریشە بۆ زیاد بوونی باوەڕ، وە هۆکارە بۆ پەیوەست بوون بەڕەوشتی جوانەوە، ئەگەر لە قورئانی پیرۆز ورد ببینەوە ئەوا دەبینین کە خوای پەروەردگار چەندین چیرۆکو بەسەرهاتی بەسوودی بۆ باس کردووین، بۆ ئەوەی کە دڵی پێغەمبەری خوای (ﷺ) پێی دابمەزرێت، وە ئامۆژگاریو بیرخستنەوەی باشی تێدایە بۆ باوەڕداران، وە بەدڵنیایی هەموو هەڵسوکەوتو ڕەفتارو ڕەوشتی پەیوەست بوو بە قورئانی پیرۆزەوە، وە جابری کوڕی سەمورە (خوای لێ ڕەزای بێت) دەفەرمووێت: ( كَانَ لاَ

يَقُومُ مِنْ مُصَلاَّهُ الَّذِى يُصَلِّى فِيهِ الصُّبْحَ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ، فَإِذَا طَلَعَتْ قَامَ، وَكَانُوا يَتَحَدَّثُونَ، فَيَأْخُذُونَ فِي أَمْرِ الْجَاهِلِيَّةِ، فَيَضْحَكُونَ وَيَتَبَسَّمُ )[1] .

**واتە:** پێغەمبەری خوا (ﷺ) کاتێك نوێژی بەیانی دەکرد، هەڵ نە دەستا لەو شوێنەی کە نوێژەکەی تێدا دەکرد، تاکو خۆر هەڵ دەهات، جا کاتێك خۆر هەڵ دەهات هەڵ دەستا، جا لەو ماوەیەدا قسەیان دەکردو باسی چیرۆكو بەسەرهاتی سەردەمی نەزانیان دەکردو پێ دەکەنین، وە پێغەمبەری خوا (ﷺ) زەردەخەنە دەیگرت، هەروەها پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ( حَدِّثُوا عَنْ بَنِي إِسْرَائِيلَ وَلاَ حَرَجَ، فَإِنه كَانتْ فِيهِم الأَعَاجِيب )[2] .

**واتە:** لە بەنی ئیسرائیلەوە شت بگێڕنەوە، چونکە لەناو ئەواندا شتی زۆر سەر سوڕهێنەر هەیە، وە بەدڵنیایی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەم چیرۆكو بەسەرهاتانەمان بۆ دەگێڕێتەوە، بۆ ئەوەی پەندو ئامۆژگاری لێ وەربگرین، هەروەها بۆ بەهێزبوونی باوەڕمان، بۆیە منیش هەستام بە کۆکردنەوەو وەرگێڕانی (٢٩) چیرۆكو بەسەرهات لە فەرموودە ڕاستەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەئومێدی ئەوەی کە ببێتە مایەی سودو کەڵك لێ وەرگرتن بۆ باوەڕداران .

✍ م. أبوبكر أحمد قادر

٢٥/ربيع الثاني/١٤٣٠

---

(١) أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ (٦١٧٩) .

(٢) (صَحِيح) أَخْرَجَهُ أَحْمَد، وَ صَحَّحَهُ الشَّيْخ الأَلْبَانِي فِي سِلسِلة الأَحادِيث الصَّحِيحَة (٢٩٢٦) .

## القِصَّة الأُولَى: الرَّجُل الَّذِي قَتَلَ تِسْعَةَ وَتِسْعِينَ نَفْساً

عَنْ أَبِي سَعِيد الْخُدْرِيِّ (رضي الله عنه) أَنَّ نَبِيَّ اللَّه (ﷺ) قَالَ: كَانَ فِيمَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ رَجُلٌ قَتَلَ تِسْعَةً وَتِسْعِينَ نَفْسًا، فَسَأَلَ عَنْ أَعْلَمِ أَهْلِ الأَرْضِ، فَدُلَّ عَلَى رَاهِب فَأَتَاهُ فَقَالَ إِنَّهُ قَتَلَ تِسْعَةً وَتِسْعِينَ نَفْسًا فَهَلْ لَهُ مِنْ تَوْبَة فَقَالَ لاَ فَقَتَلَهُ فَكَمَّلَ بِهِ مِائَةً، ثُمَّ سَأَلَ عَنْ أَعْلَمِ أَهْلِ الأَرْضِ فَدُلَّ عَلَى رَجُلٍ عَالِمٍ فَقَالَ إِنَّهُ قَتَلَ مِائَةَ نَفْسٍ فَهَلْ لَهُ مِنْ تَوْبَة فَقَالَ نَعَمْ وَمَنْ يَحُولُ بَيْنَهُ وَبَيْنَ التَّوْبَةِ انْطَلِقْ إِلَى أَرْضِ كَذَا وَكَذَا فَإِنَّ بِهَا أُنَاسًا يَعْبُدُونَ اللَّهَ فَاعْبُدِ اللَّهَ مَعَهُمْ وَلاَ تَرْجِعْ إِلَى أَرْضِكَ فَإِنَّهَا أَرْضُ سَوْءٍ فَانْطَلَقَ حَتَّى إِذَا نَصَفَ الطَّرِيقَ أَتَاهُ الْمَوْتُ فَاخْتَصَمَتْ فِيهِ مَلاَئِكَةُ الرَّحْمَةِ وَمَلاَئِكَةُ الْعَذَابِ فَقَالَتْ مَلاَئِكَةُ الرَّحْمَةِ جَاءَ تَائِبًا مُقْبِلاً بِقَلْبِهِ إِلَى اللَّهِ وَقَالَتْ مَلاَئِكَةُ الْعَذَابِ إِنَّهُ لَمْ يَعْمَلْ خَيْرًا قَطُّ فَأَتَاهُمْ مَلَكٌ فِي صُورَةِ آدَمِيٍّ فَجَعَلُوهُ بَيْنَهُمْ فَقَالَ قِيسُوا مَا بَيْنَ الأَرْضَيْنِ فَإِلَى أَيَّتِهِمَا كَانَ أَدْنَى فَهُوَ لَهُ فَقَاسُوهُ فَوَجَدُوهُ أَدْنَى إِلَى الأَرْضِ الَّتِي أَرَادَ فَقَبَضَتْهُ مَلاَئِكَةُ الرَّحْمَةِ[1]

## چیرۆکی یەکەم: ئەو پیاوەی سەد کەسی کوشتبوو

هاوەڵی خۆشەویست ئەبو سەعیدی خودری (خوای لێ ڕەزای بێت) دەفەرمووێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: لە پێش ئێوەدا لە بەنی ئیسرائیل پیاوێك نەوەدو نۆ كەسی كوشتبوو، ئینجا پرسیاری كرد سەبارەت بە زاناترین كەسی سەرزەوی، دەستنیشانی پیاوێكی خواپەرستی بۆ كرا،

---

(١) أَخرَجَهُ مُسْلِمٌ (٧١٨٤) .

ئەویش ڕۆیشتە لایو پێی وت: من نەوەدو نۆ کەسم کوشتووە ئایا بۆم هەیە تەوبە بکەم؟

خوا پەرستەکە ووتی: نەخێر، پیاوەکە خواپەرستەکەی کوشتو بوو بە سەد کەس، پاشان پرسیاری کرد سەبارەت بە زاناترین کەسی سەر زەوی، وە دەستنیشانی پیاوێکی زانای بۆ کرا، پیاوەکە چووە لایو پێی ووت: من سەد کەسم کوشتووە، ئایا بۆم هەیە تەوبە بکەم؟

زاناکە ووتی: بەڵێ، کێ ڕێگە لە تەوبەی تۆ دەگرێت، بڕۆ بۆ ئەو زەوییە دەستنیشانی دێیەکی بۆکرد، چونکە ئەو دێیە خەڵکانێکی تێدایە خوای پەروەردگار دەپەرستن، تۆش لەوێ خوا بپەرستە، وە نەگەڕێیتەوە بۆ خاکەکەی خۆت، چونکە شوێنێکی خراپە، پیاوەکە ڕۆیشت تاکو گەیشتە نیوەی ڕێگەکەو مردن ڕێگەی پێگرت، لەو جێگەیەدا مەلائیکەی ڕەحمەتو مەلائیکەی سزا هەریەکەیان دەیویست ڕوحی ببات، مەلائیکەی ڕەحمەت ووتی: ئەم پیاوە لە شوێنی خۆی دەرچووەو تەوبە کارەو بە دڵی ڕووی کردۆتە خوای پەروەردگار،هەروەها مەلائیکەی سزا ووتی: لە ژیانیدا هیچ خێرو چاکەیەکی نەکردووە، خوای پەروەردگار مەلائیکەیەکی لەسەر شێوەی مرۆڤ بۆ ڕەوانە کردن، ئەوانیش کردیان بە دادوەر لەنێوان خۆیاندا، مەلائیکەتەکەی کە لەسەر شێوەی مرۆڤدا بوو ووتی: هەر دوو زەویەکە بپێون لە هەر لایەکیانەوە نزیك بوو، ئەوا بۆ ئەوەتانە، دوو مەلائیکەتەکەش زەویەکانیان پێوا بینییان بە بستێك لەو دێیەوە نزیکە کە ویستی بۆی بڕوات، بۆیە مەلائیکەی ڕەحمەت بردی .

**چەند سوودو ئامۆژگارییەك لەم چیرۆكەدا.**

(١) دروست نییە بۆ هیچ کەسێك فەتوا بدات بۆ خەڵکی، ئەگەر حوکمی ئەو شتە نەزانێت، چ جای خوا ناسیش بێتو شارەزایشی هەبێت لە هەندێك بواری ئاییندا، چونکە ئەگەر ئەو خواناسە شارەزا بوایە بە شەرعی خوا، ئەوا دەرگای تەوبەی دانەدەخستو نەفسی خۆشی لەدەست نەدەدا .

(٢) دەبێت نەزان پرسیار لە کەسێك بکات کە زانابێت بە شەرعی خوا، تاکو کێشەکەی بۆ چارەسەر بکات .

(٣) خوای پەروەردگار زۆر بەڕەحمو بەسۆزو لێبوردەیە بەرامبەر بە بەندەکانی، ئەگەر چی بەندەکان گوناهـ و تاوانەکانیان بەئەندازەی کەفی سەر دەریا بێت، بەمەرجێك تەوبە بکەنو بگەڕێنەوە بۆلای، پەروەردگار دەفەرمووێت: ﴿ قُلْ يَٰعِبَادِيَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُواْ مِن رَّحْمَةِ ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًاۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٥٣﴾ ﴾ سورة الزمر .

**واتە :** ئەی موحەممەد (ﷺ) پێیان بڵێ: پەروەردگار دەفەرمووێت: ئەی بەندەکانم ئەوانەی گوناهـ و تاوانتان زۆرە، بێ ئومێد مەبن لە ڕەحمو بەزەیی پەروەردگار، چونکە بەڕاستی پەروەردگار لە هەموو تاوانەکانتان خۆش دەبێت (ئەگەر تەوبەی ڕاستەقینە بکەن) بەڕاستی پەروەردگار زۆر لێخۆشبوو بەبەزەییو میهرەبانە .

(٤) زانا بەشەرعی خوا ئەو کەسەیە دەرگای تەوبە دەکاتەوە بۆ خەڵکی، وە دەرگای شەڕو خراپەکاریو بێ ئومێد بوون لە ڕەحمەتی خوا دادەخات .

(٥) پێویستە لەسەر ئەو کەسەی کە تەوبە دەکاتو دەگەڕێتەوە بۆ لای خوای گەورە، لە برادەرو هاوڕێی خراپ دوور بکەوێتەوە .

(٦) پێویستە لەسەر ئەو کەسەی کە تەوبە دەکات نزیك بکەوێتەوە لەو کەسانەی کە کاری باشو خێر ئەنجام دەدەن، چونکە مرۆڤ لەسەر ئایینی برادەرو خۆشەویستەکەیەتی .

(٧) پێویستی گەڕانەوە بۆلای زانایان لە کاتی کێشەو دووبەرەکیدا .

(٨) نابێت لە کەسی گوناهبارو تاوانکار بێ ئومێد بین، چونکە نازانین بەچی کۆتایی بەژیانی دێت .

(٩) فەزڵو گەورەیی مرۆڤی خواپەرستو زانا بەسەر مرۆڤێك کە تەنها خوا پەرستە، چ جای بەسەر خەڵکی ئاساییدا .

(١٠) توانای مەلائیکە بۆ خۆخستنە سەر شێوەی مرۆڤەکان بەو یستی پەروەردگار، وەکو ئەو مەلائیکەتەی خوای پەروەردگار لەسەر شێوەی مرۆڤ ناردی بۆئەوەی کێشەی نێوان مەلائیکەی ڕەحمەتو مەلائیکەی سزا چارەسەر بکات .

## القِصَّةُ الثَّانِيَةُ: الرَّجُلُ الَّذِي تَجَاوَزَ اللهُ عَنْهُ

عَنْ حُذَيْفَةَ (رضي الله عنه) قَالَ قَالَ: رَسُولُ اللَّهِ(ﷺ) « تَلَقَّتِ الْمَلاَئِكَةُ رُوحَ رَجُلٍ مِمَّنْ كَانَ قَبْلَكُمْ، فَقَالُوا: أَعَمِلْتَ مِنَ الْخَيْرِ شَيْئًا قَالَ: لاَ، قَالُوا: تَذَكَّرْ. قَالَ: كُنْتُ أُدَايِنُ النَّاسَ فَآمُرُ فِتْيَانِي أَنْ يُنْظِرُوا الْمُعْسِرَ وَيَتَجَوَّزُوا وَفِي رِوَايَةٍ (وَأَتَجَاوَزُ) عَنِ الْمُوسِرِ، قَالَ قَالَ: اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ تَجَوَّزُوا عَنْهُ » وَفِي رِوَايَةٍ ( قَالَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ نَحْنُ أَحَقُّ بِذَلِكَ مِنْهُ تَجَاوَزُوا عَنْهُ )[١].

## چیرۆکی دووەم: ئەو پیاوەی پەروەردگار چاو پۆشی لێکرد

هاوەڵی خۆشەویست حوذەیفە (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمووێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: مەلائیکەتەکان ڕۆحی پیاوێك لە ئوممەتانی پێش ئێوە یان وەرگرتورۆحیان کێشا، ئینجا مەلائیکەتەکان بە پیاوەکەیان وت: ئایا تۆ هیچ خێرو چاکەت کردووە؟ پیاوەکە ووتی: نەخێر، مەلائیکەکان ووتیان: بیر بکەرەوە، پیاوەکە ووتی: من لە دونیادا قەرزم دەدا بەخەڵك، وە فەرمانم دەکرد بە کارمەندەکانم چاوەڕوانی دواخستنی هێنانەوەی قەرزی نەدارو دەست کورت بکەنو خاتری دەست ڕۆیشتووش بگرن، هەروەها چاوپۆشیشی لێبکەن، ئینجا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: پەروەردگار بەمەلائیکەتەکانی فەرموو: ئێوەش لێی ببورنو چاوپۆشی لێبکەن. یان فەرمووی: ئێمە شایستەترین بەو ڕەوشتە، چاو پۆشی لێبکەنو لێی ببورن .

---

(١) أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ (٢٠٧٧) وَمُسْلِمٌ (٣٩٦٩) .

**چەند سوودو ئامۆژگارییەك لەم چیرۆکەدا.**

(١) بەخشندەیی‌و میهرەبانی خوای پەروەردگار بەرامبەر بەندەکانی، لە بەندەیەکی خۆش دەبێت بەهۆی ئەوەی قەرزی داوە بەخەڵکی‌و چاو پۆشی لەو کەسەش کردووە کە نەی بووە قەرزەکەی بداتەوە .

(٢) فەزڵ‌و گەورەیی قەرزدان بەخەڵکی و چاوەڕوانی کردن‌و دواخستنی هێنانەوەی قەرز لای قەرزار .

(٣) کەس بە کردەوەی خراپ کافر نابێت ئەگەر باوەڕدار بێت، ئەو پیاوە تەنها کارێکی چاکەی نەکردبوو، جگەلەوەی قەرزی دەدا بە خەڵکی‌و پاشان چاوەڕوانی دواخستنی هێنانەوەی قەرزەکەی دەکرد .

(٤) بەڵگەیەکی گەورەی تێدایە لەسەر بنەمایەکی گەورە دەربارەی سیفەتەکانی خوای پەروەردگار، ئەویش چاوپۆشیکردن‌و لێ بووردنییە، پەروەردگار بە مەلائیکەتەکانی فەرموو: ئێمە شایستەترین بەو ڕەوشتە، چاو پۆشی لێبکەن‌و لێی ببورن .

(٥) هەر کەسێك چاوپۆشی‌و کار ئاسانی لە قەرزێك بکات کە لای هەژار بێت، ئەوا پەروەردگار کار ئاسانی بۆ دەکات، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ( وَمَنْ يَسَّرَ عَلَى مُعْسِرٍ يَسَّرَ اللَّهُ عَلَيْهِ فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ )[1] .

**واتە:** هەر کەسێك کار ئاسانی بۆ قەرزی هەژار بکات‌و لەقەرزەکەی ببورێت، ئەوا پەروەردگار کاری دونیاو دواڕۆژی بۆ ئاسان دەکات .

---

(١) أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ (٦٧٩٣) .

(٦) کار ئاسانی بۆ قەرز لای هەژار، هۆکارە بۆ ئەوەی کە ڕزگارت بێت لە ناڕەحەتییەکانی ڕۆژی دوایی، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ( مَنْ سَرَّهُ أَنْ يُنْجِيَهُ اللَّهُ مِنْ كُرَبِ يَوْمِ الْقِيَامَةِ فَلْيُنَفِّسْ عَنْ مُعْسِرٍ أَوْ يَضَعْ عَنْهُ )[١] .

**واتە:** هەر کەسێك پێی خۆشە پەروەردگار ڕزگاری بکات لە ناڕەحەتییەکانی ڕۆژی دوایی، ئەوا با قەرزی قەرزاری هەژار کەم بکاتەوە، یان لێی خۆش بێتو دەستی لێ هەڵگرێت .

(٧) چاوەڕوانی کردنو دواخستنی قەرز لای هەژار، بەئەندازەی قەرزەکە خێر بۆ خاوەن قەرز دەنوسرێت، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ( مَنْ أَنْظَرَ مُعْسِرًا كَانَ لَهُ بِكُلِّ يَوْمٍ صَدَقَةٌ وَمَنْ أَنْظَرَهُ بَعْدَ حِلِّهِ كَانَ لَهُ مِثْلُهُ فِي كُلِّ يَوْمٍ صَدَقَةٌ)[٢]

**واتە:** هەرکەسێك چاوەڕوانی دواخستنی هێنانەوەی قەرز لەلای هەژارو دەست کورت بکات، پێش ئەوەی کاتی هاتنی دانەوەی قەرزەکە بێت، ئەوا هەموو ڕۆژێك بەئەندازەی ئەو قەرزە خێرو چاکەی بۆ دەنوسرێت، هەروەها هەرکەسێکیش چاوەڕوانی دواخستنی هێنانەوەی قەرز لەلای هەژارو دەست کورت بکات، لە دوای تێپەڕ بوونی کاتی هێنانەوەی قەرزەکە، ئەوا هەموو ڕۆژێك بەئەندازەی دوو ئەوەندەی قەرزەکە خێری بۆ دەنوسرێت .

---

(١) أَخرَجَهُ مُسْلِمٌ (٣٩٧٦) .

(٢) (صَحِيح) أَخرَجَهُ ابن مَاجَة فِي السُّنَن (٢٤١٨)، وَصَحَّحَهُ الشَّيْخ الأَلْبَانِي فِي صَحِيح الْجَامِع (٦١٠٨).

(٨) چاوەڕوانی کردن و دواخستنی قەرز لای هەژار، هۆکارە بۆ ئەوەی خاوەن قەرز لە ژێر سێبەری عەرشی پەروەردگاردا حەشر بکرێت، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ( مَنْ أَنْظَرَ مُعْسِرًا أَوْ وَضَعَ عَنْهُ أَظَلَّهُ اللَّهُ فِي ظِلِّهِ )[1] .

**واتە:** هەرکەسێك چاوەڕوانی دواخستنی هێنانەوەی قەرز لەلای هەژارو دەست کورت بکات، یان لە قەرزەکەی دا بشکێنێت و دەست لە قەرزەکەی هەڵبگرێت، ئەوا پەروەردگار لە ڕۆژی دواییدا ئەو خاوەن قەرزە دەخاتە ژێر سێبەری عەرشی خۆیەوە، وە لەو ڕۆژەدا هیچ سێبەرێك نییە جگە لەسێبەری عەرشی خوای پەروەردگار .

(٩) هەندێك لە زانایان دەفەرموون: قەرزدان بەخەڵکی چاکترو گەورەترە لە خێرو صەدەقەی سوننەت، چونکە خێرو صەدەقەی سوننەت دەدرێت بە هەژارو دەست کورت و نەبوو جگە لەوانیش، بەڵام قەرز جگە لە دەست کورت و نەبوو هیچ کەسی تر داوای قەرز ناکات .

---

(١) أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ (٧٤٣٧) .

## القِصَّةُ الثَّالِثَةُ: الثَّلاثَةُ الَّذِينَ آوَاهُمُ الغَار

عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ(رضي الله عنهما) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يَقُولُ: بَيْنَمَا ثَلاثَةُ نَفَرٍ يَمْشُونَ أَخَذَهُمُ الْمَطَرُ، فَأَوَوْا إِلَى غَارٍ فِي جَبَلٍ، فَانْحَطَّتْ عَلَى فَمِ غَارِهِمْ صَخْرَةٌ مِنَ الْجَبَلِ فَانْطَبَقَتْ عَلَيْهِمْ، فَقَالَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ: انْظُرُوا أَعْمَالاً عَمِلْتُمُوهَا صَالِحَةً لِلَّهِ فَادْعُوا اللَّهَ بِهَا لَعَلَّهُ يُفَرِّجُهَا عَنْكُمْ، قَالَ أَحَدُهُمْ: اللَّهُمَّ إِنَّهُ كَانَ لِي وَالِدَانِ شَيْخَانِ كَبِيرَانِ، وَلِي صِبْيَةٌ صِغَارٌ كُنْتُ أَرْعَى عَلَيْهِمْ، فَإِذَا رُحْتُ عَلَيْهِمْ حَلَبْتُ، فَبَدَأْتُ بِوَالِدَيَّ أَسْقِيهِمَا قَبْلَ بَنِيَّ، وَإِنِّي اسْتَأْخَرْتُ ذَاتَ يَوْمٍ فَلَمْ آتِ حَتَّى أَمْسَيْتُ فَوَجَدْتُهُمَا نَامَا فَحَلَبْتُ كَمَا كُنْتُ أَحْلُبُ، فَقُمْتُ عِنْدَ رُءُوسِهِمَا أَكْرَهُ أَنْ أُوقِظَهُمَا وَأَكْرَهُ أَنْ أَسْقِيَ الصِّبْيَةَ، وَالصِّبْيَةُ يَتَضَاغَوْنَ عِنْدَ قَدَمَيَّ حَتَّى طَلَعَ الْفَجْرُ، فَإِنْ كُنْتَ تَعْلَمُ أَنِّي فَعَلْتُهُ ابْتِغَاءَ وَجْهِكَ فَافْرُجْ لَنَا فَرْجَةً نَرَى مِنْهَا السَّمَاءَ فَفَرَجَ اللَّهُ فَرَأَوُا السَّمَاءَ، وَقَالَ الآخَرُ: اللَّهُمَّ إِنَّهَا كَانَتْ لِي بِنْتُ عَمٍّ أَحْبَبْتُهَا كَأَشَدِّ مَا يُحِبُّ الرِّجَالُ النِّسَاءَ، فَطَلَبْتُ مِنْهَا فَأَبَتْ حَتَّى أَتَيْتُهَا بِمِائَةِ دِينَارٍ فَبَغَيْتُ حَتَّى جَمَعْتُهَا، فَلَمَّا وَقَعْتُ بَيْنَ رِجْلَيْهَا قَالَتْ: يَا عَبْدَ اللَّهِ اتَّقِ اللَّهَ، وَلاَ تَفْتَحِ الْخَاتَمَ إِلاَّ بِحَقِّهِ فَقُمْتُ، فَإِنْ كُنْتَ تَعْلَمُ أَنِّي فَعَلْتُهُ ابْتِغَاءَ وَجْهِكَ فَافْرُجْ عَنَّا فَرْجَةً فَفَرَجَ وَقَالَ الثَّالِثُ: اللَّهُمَّ إِنِّي اسْتَأْجَرْتُ أَجِيرًا بِفَرَقِ أَرُزٍّ، فَلَمَّا قَضَى عَمَلَهُ قَالَ: أَعْطِنِي حَقِّي فَعَرَضْتُ عَلَيْهِ فَرَغِبَ عَنْهُ، فَلَمْ أَزَلْ أَزْرَعُهُ حَتَّى جَمَعْتُ مِنْهُ بَقَرًا وَرَاعِيهَا فَجَاءَنِي فَقَالَ: اتَّقِ اللَّهَ، فَقُلْتُ: اذْهَبْ إِلَى ذَلِكَ الْبَقَرِ وَرُعَاتِهَا فَخُذْ فَقَالَ: اتَّقِ اللَّهَ وَلاَ تَسْتَهْزِئْ بِي فَقُلْتُ: إِنِّي لاَ أَسْتَهْزِئُ بِكَ فَخُذْ فَأَخَذَهُ، فَإِنْ كُنْتَ تَعْلَمُ أَنِّي فَعَلْتُ ذَلِكَ ابْتِغَاءَ وَجْهِكَ فَافْرُجْ مَا بَقِيَ، فَفَرَجَ اللَّهُ[1].

---

(١) أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ (٢٣٣٣) وَمُسْلِمٌ (٦٨٨٤) .

## چیرۆکی سێ یەم: ئەو سێ کەسەی چوونە ناو ئەشکەوتەکەوە

هاوەڵی خۆشەویست عەبدوڵلای کوڕی عومەر(خوایان لێ ڕازی بێت) دەفەرمووێت: گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەیفەرموو: سێ کەس لە ئوممەتانی پێش ئێوە ڕۆیشتن‌و دەرچوونە دەرەوەی دێ، جا توشی باران بارین بوون، پەنایان بردە بەر ئەشکەوتێك، کاتێك کە چوونە ناو ئەشکەوتەکەوە، بەردێك لە شاخەکەوە کەوتە خوارەوەو دەرگای ئەشکەوتەکەی گرت، وە ئەوانیش بێ ئومێد بوون، ئینجا لەناو خۆیاندا بەیەکتریان ووت: سەیری چاکەتان بکەن، ئەو کردەوانەی کە ئەنجامتان داوە کامیان لەبەر ڕەزامەندی پەروەردگار بووە، بپاڕێنەوە پێی بەڵکو ڕزگارمان بێت .

**یەکێکیان ووتی:** خوایە خۆت ئاگاداری دایك‌و باوکێکم هەبوو چوو بوونە ناوساڵەوە، وە منداڵی بچوکیشم هەبوو شوانیم بۆ دەکردن؛ ئینجا هەرکات شیرم دەدۆشی‌و دەم هێنایەوە لە پێشدا لە دایك‌و باوکمەوە دەستم پێدەکرد پێش ئەوەی بیدەم بەمنداڵەکانم، وە ڕۆژێکیان درەنگ هاتمەوە کاتێك بینیم دایك‌و باوکم نوستوون، وە شیرەکەم دۆشی بوو وەك جاران، جا لەلای سەریانەوە ڕاوەستام، پێم ناخۆش بوو خەبەریان بکەمەوە، وە پێشم ناخۆش بوو کە لە پێشدا بیدەم بەمنداڵەکانم لە کاتێکدا منداڵەکانم لای پێم دەگریان‌و دەنوزانەوە لەبرساندا تاکو بەیانی ڕۆژ بووەوە، وە خوایە ئەگەر ئەو کارەم لەبەر خاتری تۆ کردووە لەم ناڕەحەتییە ڕزگارمان بکەو ئەم بەردە لابدەو دەرگامان بۆ بکەرەوە بتوانین ئاسمان ببینین، پەروەردگار بەردەکەی جوڵاندو ئاسمانیان بینی .

**دووەمیان ووتی:** خوایە کچە مامێکم هەبوو زۆرم خۆش دەویست زیاتر لە خۆش ویستنی پیاو بۆ خێزانەکەی، وە جارێکیان داوای کاری بێ شەرعیم لێکرد ئەویش ڕازی نەبوو، ووتی: تاکو سەد دینارم پێنەدەی ڕازی نابم، وە منیش چووم تاکو سەد دینارم پەیداکرد، وە کاتێك ویستم کاری خراپی لەگەڵدا ئەنجام بدەم، کچی مامەکەم پێی ووتم: ئەی بەندەی خوا لە خوا بترسە، وە بۆت دروست نییە جووت ببی لەگەڵمدا مەگەر بە حەلاڵی نەبێت، وە منیش هەستامو ئەو کارەم نەکرد هەرچەندە دەشم توانی ئەو کارە بکەم، خوایە ئەگەر ئەو کارەم لەبەر ڕەزامەندی تۆ کردووە لەم ناڕەحەتییە ڕزگارمان بکەو دەرگامان بۆ بکەرەوە، ئینجا بەردەکە کەمێکی تری لێ جولا.

**سێیەمیان ووتی:** خوایە منیش کرێکارێکم بەکرێ گرتبوو، بە حەوت کیلۆ برنج، جا کاتێك لە کارەکەی بووەوە، ووتی: کرێکەم پێ بدە، منیش کرێکەی حەوت کیلۆ برنج بوو، خستمە بەردەستی ئەویش پێی ڕازی نەبوو توڕەبوو، جا کاتێك کرێکارەکە ڕۆیشتو بە کرێکەی ڕازی نەبوو، منیش برنجەکەم بۆی تۆو کردو برنجەکە گوڵی کردوو ئینجا بۆیم دورییەوەو بۆیم کۆکردەوەو، تاکو چەند مانگایەکم لێ کڕی بۆی، پاش ماوەیەك کابرای کرێکار هاتەوەو پێمی ووت: لە خوا بترسە حەقم مەخۆ، منیش پێم ووت: بچۆ بۆلای ئەو مانگایانەو بۆ خۆتی ببە، ئەویش پێی ووتم: لە خوا بترسەو گاڵتەم پێ مەکە، منیش پێم ووت: گاڵتەت پێناکەم بڕۆ بیبە، ئەویش بردی، خوایە ئەگەر ئەم کارەم لەبەر ڕەزامەندی تۆ کردووە لەم ناڕەحەتییە ڕزگارمان بکەو دەرگامان بۆ بکەرەوەو، ئەو بەردە لابدە، ئینجا بەردەکە لاچوو ئەوانیش ڕزگاریان بوو.

## چەند سوودو ئامۆژگارییەك لەم چیرۆکەدا.

(١) فەزڵو گەورەیی نیەت پاکی لە کردەوەدا، ئەگەرچی تەنها کردەوەیەکیش بێت .

(٢) کردەوەی چاكو باش لەکاتی خۆشیدا ئەنجامی بدەیت سوودت پێ دەگەیەنێت لەکاتی ناڕەحەتیو سەختیدا، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ( تَعَرَّفْ إِلَى اللَّهِ فِي الرَّخَاءِ يَعْرِفْكَ فِي الشِّدَّةِ )[1].

**واتە :** لە کاتی خۆشگوزەرانیو ژیان خۆشیدا پەروەردگار بناسەو بیپەرستەو سنوورەکانی بپارێزەو لە گوناهوتاوان دوربکەوەرەوە، پەروەردگار لە کاتی ناڕەحەتیو ناخۆشیدا ئەت ناسێتو بەهاناتەوە دێتو ڕزگارت دەکاتو دەتپارێزێت .

(٣) پێویستە لەسەر موسڵمان لە کاتی پاڕانەوەدا تەنها پشت بە خوای پەروەردگار ببەستێتو داوا لە جگە لە پەروەردگار نەکاتو خۆی توشی هاوبەش بڕیاردان نەکات، چونکە پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ وَلَا تَدْعُ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَنفَعُكَ وَلَا يَضُرُّكَ ﴿١٠٦﴾ ﴾ سورة یونس .

واتە: جگە لە (ﷲ) هاناو هاوار نەبەیت بۆ هیچ کەسێك یان هیچ شتێك، نە قازانجو نە سوودت پێ دەگەیێنێت وە نە زیان، چونکە قازانجو زیان تەنها بەدەست خوای پەروەردگارە .

---

(١) (صَحِيح) أَخْرَجَهُ أَحْمَد وَالطَّبَرَانِيّ وصَحَّحَهُ الشَّيْخ الأَلْبَانِي فِي صَحِيح الْجَامِع (٢٩٦١) .

(٤) دروستە بۆ موسڵمان بە کردەوە چاکەکانی بپاڕێتەوە بەتایبەتی ئەو کردەوانەی کە لەبەر ڕەزامەندی خوای گەورە ئەنجامی داوە .

(٥) فەزڵ‌و گەورەیی چاکەکردن لەگەڵ دایك‌و باوکدا، وە گوێڕایەڵی کردنیان لە چاکەدا .

(٦) خۆشەویستی پەروەردگار پێش دەخرێت، بەسەر خۆشەویستی نەفسی خۆت بۆ هەواو ئارەزوو .

(٧) هەرکەسێك واز لە کاری خراپ بهێنێت بەتایبەت زینا، لەترسی پەروەردگار، ئەوا پەروەردگار ڕزگاری دەکات لە ناڕەحەتی .

(٨) فەزڵ‌و گەورەیی پاراستنی ئەمانەت‌و دانەوەی بەخاوەنی .

(٩) دروست نییە کرێی کرێکار دوابخرێت چونکە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ( أَعْطُوا الأَجِيرَ أَجْرَهُ قَبْلَ أَنْ يَجِفَّ عَرَقُهُ )[١] .

واتە کرێ‌و پارەی کرێکار بدەن پێش ئەوەی عارەقەکەی وشك ببێتەوە .

(١٠) دروستە گەشە پێدانی پارەی کرێکار، وە کارێکی چاکە بەمەرجێك بەرژەوەندی خاوەن پارە (کرێکارەکە)ی تێدابێت .

(١١) خاوەن کارەکە چاکەی کرد لەگەڵ کرێکارەکەدا، بەوەی ماڵەکە بۆزیادکردوو گەشەی پێدا، بەڵام کرێکارەکە چاکەی نەکرد لەگەڵ خاوەن کارەکە، دەبوایە هەقی ماندوو بوونەکەی پێ بدایە .

(١٢) هەژاری‌و نەبوونی هۆکارە بۆ بڵاو بوونەوەی خراپە کاری .

---

(١) (صَحِيح) أَخْرَجَهُ ابن مَاجَه فِي السُّنَن (٢٤٤٣)، وصَحَّحَهُ الشَّيْخ الأَلْبَانِي فِي صَحِيح الْجَامِع (١٠٥٥).

**تێبینی/** ئایا لەو سێ کەسەدا کامیان زیاتر پاڕانەوەکەی سوودی هەبووە بۆ هاوڕێو برادەرەکانی وە بۆ لابردنی بەردەکە .

**پێشەوا** ئیبنو حەجەر (ڕەحمەتی خوای لێ بێت)[1]، دەفەرمووێت: کەسی سێ یەمیان، چونکە یەکەمیان لە تاریکی ڕزگاری کردن، وە دووەمیان تۆزێك لە شوێنی دەرباز بوونی فراوان کردەوە، بۆ نموونە ئەگەر کەسێك بەلایاندا بڕواتو بیان بینێت چارەسەرێکیان بۆ بدۆزێتەوە، بەڵام سێ یەمیان پاڕانەوەکەی بووە هۆی لاچونی بەردەکەو ڕزگار بوونیان، بۆیە دەگونجێت کەسی سێیەمیان کردەوەکەی باشترو چاکتر بووبێت لەو دوانەی تر، وە کەسی یەکەم کە لەگەڵ دایك وباوکیدا باش بووە کەمتەرخەمی تێدا بووە، هەروەها سێیەمیان پیاوێکی ئەمانەت پارێز بووە، وە کەسی دووەم چاکترینیان بووە چونکە دڵی ترسی خوای تێدا بووە، پەروەردگاردەفەرمووێت: ﴿وَأَمَّا مَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِۦ وَنَهَى ٱلنَّفْسَ عَنِ ٱلْهَوَىٰ ﴿٤٠﴾ فَإِنَّ ٱلْجَنَّةَ هِىَ ٱلْمَأْوَىٰ ﴿٤١﴾﴾ سورة النازعات .

**واتە:** بەڵام ئەوەی لە خوای پەروەردگار ترسابێتو جڵەوی گرتبێتەوە لە هەوەسو ئارەزووەکان، ئەوا بەدڵنیایی تەنها بەهەشت جێگەی حەوانەوەیەتی .

هەروەها کەسی دووەم وازی لەو پارەیەش هێنا کە بۆ ئەو کارە خراپەیە پەیدای کردبوو.

---

(١) فَتْح الْبَارِي شَرْح صَحِيح الْبُخَارِيّ، لِلْحَافِظ: احمد ابْن حَجَر الْعَسْقَلانِيّ(رَحِمَهُ اللّه)(١٠/٢٦٨/٣٢٠٦) .

## القِصَّة الرَّابِعَة: الرَّجُل الَّذِي أمَرَ أوْلادَه أنْ يَحْرقُوهُ بَعْدَ مَوْتِه

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: « كَانَ رَجُلٌ يُسْرِفُ عَلَى نَفْسِهِ، فَلَمَّا حَضَرَهُ الْمَوْتُ، قَالَ لِبَنِيهِ: إِذَا أَنَا مُتُّ فَأَحْرِقُونِي ثُمَّ اطْحَنُونِي ثُمَّ ذَرُّونِي فِي الرِّيحِ، فَوَاللَّهِ لَئِنْ قَدَرَ عَلَيَّ رَبِّي لَيُعَذِّبَنِّي عَذَابًا مَا عَذَّبَهُ أَحَدًا، فَلَمَّا مَاتَ فُعِلَ بِهِ ذَلِكَ، فَأَمَرَ اللَّهُ الأَرْضَ فَقَالَ: اجْمَعِي مَا فِيكِ مِنْهُ، فَفَعَلَتْ فَإِذَا هُوَ قَائِمٌ، فَقَالَ: مَا حَمَلَكَ عَلَى مَا صَنَعْتَ، قَالَ: يَا رَبِّ، خَشْيَتُكَ، فَغَفَرَ لَهُ »[1] .

## چیرۆكی چوارەم: ئەوپیاوەی فەرمانیكرد بە منداڵەكانی لاشەی بسوتێنن دوای مردنی

هاوەڵی خۆشەویست ئەبو هورەیرە (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمووێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: پیاوێك هەبوو بێ ئاگاو غافڵ بوو لە نەفسی خۆی بەردەوام تاوانی ئەنجام دەدا، جا كاتی مردنی نزیك بووەوە بە منداڵەكانی وت: ئەگەر مردم بمسوتێننو بمدەن بەدەم بادا لە ڕۆژێكدا بای بێت، چونكە سوێند بەخوا ئەگەر پەروەردگارم بم دۆزێتەوەو توانای بەسەرمدا هەبێت، ئەوا سزادانێك سزام دەدات هیچ كەسێكی بەو شێوەیە سزا نەدابێت، جا كاتێك مرد منداڵەكانی ئەو كارەیان ئەنجامدا، ئینجا پەروەردگار فەرمانی كرد بەزەوی كۆی بكەرەوە چیت تێدایە، زەویش كۆی كردەوە پیاوەكە بەپێوە وەستا، پەروەردگار پێی فەرموو: چی وای لێكردی ئەم كارە بكەیت؟

پیاوەكە ووتی: پەروەردگار ترسی سزای تۆ، خوای گەورەش لێی خۆشبوو .

---

(١) أخرَجَهُ البُخَارِيُّ (٣٤٨١) .

**چەند سوودو ئامۆژگارییەك لەم چیرۆکەدا.**

(١) پێویستە مرۆڤی موسڵمان لەسەرەمەرگدا وەسیەتی باش بۆ منداڵی بکات.

(٢) ترسان لە خوای پەروەردگار لە بەرزترین پلەیە، وە پەروەردگار بەهۆیەوە لە تاوانی زۆر دەبوورێت، ئەوەبوو پەروەردگار لەو بەندەیە بوورا، هەرچەندە تاوانی زۆریشی هەبوو .

(٣) تواناو دەسەڵاتی خوای پەروەردگار بەسەر بەندەکانییەوە، هەروەها زیندو کردنەوەی بەندەکانی، وە هەرشتێکی بوێت یەکسەر دەبێت، لە ئایەتێکدا دەفەرمووێت: ﴿ أَيَحْسَبُ ٱلْإِنسَٰنُ أَلَّن نَّجْمَعَ عِظَامَهُۥ ﴿٣﴾ بَلَىٰ قَٰدِرِينَ عَلَىٰٓ أَن نُّسَوِّىَ بَنَانَهُۥ ﴿٤﴾ ﴾ سورة القيامة

**واتە:** ئایا مرۆڤەکان وادەزانن هەرگیز ئێسکەکانیان کۆ ناکەینەوە، بەڵێ، لەوەش زیاتر توانامان هەیە کە نەخشە وردەکانی سەر پەنجەکان بەدیبهێنینەوە .

(٤) نابێت گوێڕایەڵی هیچ کەسێك بکرێت لە بێ فەرمانی خوای پەروەردگاردا، ئەو پیاوە فەرمانی بە منداڵەکانی کرد لاشەی بسوتێنرێت، ئەمیش کارێکە سەرپێچی فەرمانی خوای پەروەردگارەو نابێت بۆ هیچ کەسێك ئەنجام بدرێت

(٥) دروست نیە بۆ هیچ کەسێك کەسێکی تر کافر بکات بە بیانووی ئەوەی تاوانی ئەنجامداوە، ( کافر نەکردنی کەسێکی دەستنیشان کراو هەرچەندە ووتە یاخود کرداری کوفری ئەنجام دابێت تاکو ڕاستی پێ دەگات )، ئەمەش بۆ چوونی ئەهلی سوننەو جەماعەیە .

## القِصَّةُ الخَامِسَة: الغُلامُ المُؤمِن مَعَ المَلِك الكَافِر

عَنْ صُهَيْب (رضي الله عنه) أَنَّ رَسُولَ اللَّه (ﷺ) قَالَ: كَانَ مَلِكٌ فِيمَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ وَكَانَ لَهُ سَاحِرٌ فَلَمَّا كَبِرَ قَالَ لِلْمَلِكِ: إِنِّي قَدْ كَبِرْتُ فَابْعَثْ إِلَيَّ غُلَامًا أُعَلِّمْهُ السِّحْرَ، فَبَعَثَ إِلَيْهِ غُلَامًا يُعَلِّمُهُ فَكَانَ فِي طَرِيقِهِ إِذَا سَلَكَ رَاهِبٌ فَقَعَدَ إِلَيْهِ وَسَمِعَ كَلَامَهُ فَأَعْجَبَهُ فَكَانَ إِذَا أَتَى السَّاحِرَ مَرَّ بِالرَّاهِبِ وَقَعَدَ إِلَيْهِ فَإِذَا أَتَى السَّاحِرَ ضَرَبَهُ فَشَكَا ذَلِكَ إِلَى الرَّاهِبِ فَقَالَ: إِذَا خَشِيتَ السَّاحِرَ فَقُلْ حَبَسَنِي أَهْلِي، وَإِذَا خَشِيتَ أَهْلَكَ فَقُلْ حَبَسَنِي السَّاحِرُ، فَبَيْنَمَا هُوَ كَذَلِكَ إِذْ أَتَى عَلَى دَابَّةٍ عَظِيمَةٍ قَدْ حَبَسَتِ النَّاسَ فَقَالَ: الْيَوْمَ أَعْلَمُ آلسَّاحِرُ أَفْضَلُ أَمِ الرَّاهِبُ أَفْضَلُ فَأَخَذَ حَجَرًا فَقَالَ: اللَّهُمَّ إِنْ كَانَ أَمْرُ الرَّاهِبِ أَحَبَّ إِلَيْكَ مِنْ أَمْرِ السَّاحِرِ فَاقْتُلْ هَذِهِ الدَّابَّةَ حَتَّى يَمْضِيَ النَّاسُ، فَرَمَاهَا فَقَتَلَهَا وَمَضَى النَّاسُ فَأَتَى الرَّاهِبَ فَأَخْبَرَهُ فَقَالَ لَهُ الرَّاهِبُ: أَيْ بُنَيَّ أَنْتَ الْيَوْمَ أَفْضَلُ مِنِّي، قَدْ بَلَغَ مِنْ أَمْرِكَ مَا أَرَى وَإِنَّكَ سَتُبْتَلَى، فَإِنِ ابْتُلِيتَ فَلَا تَدُلَّ عَلَيَّ، وَكَانَ الْغُلَامُ يُبْرِئُ الْأَكْمَهَ وَالْأَبْرَصَ وَيُدَاوِي النَّاسَ مِنْ سَائِرِ الْأَدْوَاءِ فَسَمِعَ جَلِيسٌ لِلْمَلِكِ كَانَ قَدْ عَمِيَ فَأَتَاهُ بِهَدَايَا كَثِيرَةٍ فَقَالَ: مَا هَا هُنَا لَكَ أَجْمَعُ إِنْ أَنْتَ شَفَيْتَنِي فَقَالَ إِنِّي لَا أَشْفِي أَحَدًا إِنَّمَا يَشْفِي اللَّهُ فَإِنْ أَنْتَ آمَنْتَ بِاللَّهِ دَعَوْتُ اللَّهَ فَشَفَاكَ، فَآمَنَ بِاللَّهِ فَشَفَاهُ اللَّهُ فَأَتَى الْمَلِكَ فَجَلَسَ إِلَيْهِ كَمَا كَانَ يَجْلِسُ فَقَالَ لَهُ الْمَلِكُ مَنْ رَدَّ عَلَيْكَ بَصَرَكَ قَالَ: رَبِّي، قَالَ: وَلَكَ رَبٌّ غَيْرِي قَالَ: رَبِّي وَرَبُّكَ اللَّهُ، فَأَخَذَهُ فَلَمْ يَزَلْ يُعَذِّبُهُ حَتَّى دَلَّ عَلَى الْغُلَامِ فَجِيءَ بِالْغُلَامِ فَقَالَ لَهُ الْمَلِكُ: أَيْ بُنَيَّ قَدْ بَلَغَ مِنْ سِحْرِكَ مَا تُبْرِئُ الْأَكْمَهَ وَالْأَبْرَصَ وَتَفْعَلُ وَتَفْعَلُ، فَقَالَ إِنِّي لَا أَشْفِي أَحَدًا إِنَّمَا يَشْفِي اللَّهُ، فَأَخَذَهُ فَلَمْ يَزَلْ يُعَذِّبُهُ حَتَّى دَلَّ عَلَى الرَّاهِبِ فَجِيءَ بِالرَّاهِبِ فَقِيلَ لَهُ: ارْجِعْ عَنْ دِينِكَ، فَأَبَى فَدَعَا بِالْمِنْشَارِ فَوَضَعَ الْمِنْشَارَ فِي مَفْرِقِ رَأْسِهِ فَشَقَّهُ حَتَّى وَقَعَ شِقَّاهُ ثُمَّ جِيءَ بِجَلِيسِ الْمَلِكِ فَقِيلَ لَهُ ارْجِعْ عَنْ دِينِكَ، فَأَبَى فَوَضَعَ الْمِنْشَارَ فِي مَفْرِقِ رَأْسِهِ فَشَقَّهُ بِهِ حَتَّى

وَقَعَ شِقَّاهُ ثُمَّ جِيءَ بِالْغُلَامِ فَقِيلَ لَهُ ارْجِعْ عَنْ دِينِكَ، فَأَبَى فَدَفَعَهُ إِلَى نَفَرٍ مِنْ أَصْحَابِهِ فَقَالَ اذْهَبُوا بِهِ إِلَى جَبَلِ كَذَا وَكَذَا فَاصْعَدُوا بِهِ الْجَبَلَ فَإِذَا بَلَغْتُمْ ذُرْوَتَهُ فَإِنْ رَجَعَ عَنْ دِينِهِ وَإِلاَّ فَاطْرَحُوهُ فَذَهَبُوا بِهِ فَصَعِدُوا بِهِ الْجَبَلَ فَقَالَ اللَّهُمَّ اكْفِنِيهِمْ بِمَا شِئْتَ، فَرَجَفَ بِهِمُ الْجَبَلُ فَسَقَطُوا وَجَاءَ يَمْشِي إِلَى الْمَلِكِ فَقَالَ لَهُ الْمَلِكُ مَا فَعَلَ أَصْحَابُكَ قَالَ: كَفَانِيهِمُ اللَّهُ، فَدَفَعَهُ إِلَى نَفَرٍ مِنْ أَصْحَابِهِ فَقَالَ اذْهَبُوا بِهِ فَاحْمِلُوهُ فِي قُرْقُورٍ فَتَوَسَّطُوا بِهِ الْبَحْرَ فَإِنْ رَجَعَ عَنْ دِينِهِ وَإِلاَّ فَاقْذِفُوهُ، فَذَهَبُوا بِهِ فَقَالَ اللَّهُمَّ اكْفِنِيهِمْ بِمَا شِئْتَ، فَانْكَفَأَتْ بِهِمُ السَّفِينَةُ فَغَرِقُوا وَجَاءَ يَمْشِي إِلَى الْمَلِكِ فَقَالَ لَهُ الْمَلِكُ مَا فَعَلَ أَصْحَابُكَ قَالَ كَفَانِيهِمُ اللَّهُ، فَقَالَ لِلْمَلِكِ إِنَّكَ لَسْتَ بِقَاتِلِي حَتَّى تَفْعَلَ مَا آمُرُكَ بِهِ، قَالَ: وَمَا هُوَ قَالَ: تَجْمَعُ النَّاسَ فِي صَعِيدٍ وَاحِدٍ وَتَصْلُبُنِي عَلَى جِذْعٍ ثُمَّ خُذْ سَهْمًا مِنْ كِنَانَتِي ثُمَّ ضَعِ السَّهْمَ فِي كَبِدِ الْقَوْسِ ثُمَّ قُلْ بِاسْمِ اللَّهِ رَبِّ الْغُلَامِ، ثُمَّ ارْمِنِي فَإِنَّكَ إِذَا فَعَلْتَ ذَلِكَ قَتَلْتَنِي. فَجَمَعَ النَّاسَ فِي صَعِيدٍ وَاحِدٍ وَصَلَبَهُ عَلَى جِذْعٍ ثُمَّ أَخَذَ سَهْمًا مِنْ كِنَانَتِهِ ثُمَّ وَضَعَ السَّهْمَ فِي كَبِدِ الْقَوْسِ ثُمَّ قَالَ: بِاسْمِ اللَّهِ رَبِّ الْغُلَامِ، ثُمَّ رَمَاهُ فَوَقَعَ السَّهْمُ فِي صُدْغِهِ فَوَضَعَ يَدَهُ فِي صُدْغِهِ فِي مَوْضِعِ السَّهْمِ فَمَاتَ فَقَالَ النَّاسُ آمَنَّا بِرَبِّ الْغُلَامِ آمَنَّا بِرَبِّ الْغُلَامِ آمَنَّا بِرَبِّ الْغُلَامِ، فَأُتِيَ الْمَلِكُ فَقِيلَ لَهُ أَرَأَيْتَ مَا كُنْتَ تَحْذَرُ قَدْ وَاللَّهِ نَزَلَ بِكَ حَذَرُكَ قَدْ آمَنَ النَّاسُ، فَأَمَرَ بِالأُخْدُودِ فِي أَفْوَاهِ السِّكَكِ فَخُدَّتْ وَأَضْرَمَ النِّيرَانَ وَقَالَ مَنْ لَمْ يَرْجِعْ عَنْ دِينِهِ فَأَحْمُوهُ فِيهَا، أَوْ قِيلَ لَهُ اقْتَحِمْ، فَفَعَلُوا حَتَّى جَاءَتِ امْرَأَةٌ وَمَعَهَا صَبِيٌّ لَهَا فَتَقَاعَسَتْ أَنْ تَقَعَ فِيهَا فَقَالَ لَهَا الْغُلَامُ يَا أُمَّهِ اصْبِرِي فَإِنَّكِ عَلَى الْحَقِّ)[1].

---

(١) أخرجهُ مُسْلِمٌ (٧٤٣٦).

## چیرۆکی پێنجەم: لاوێکی باوەڕدار لەگەڵ پادشایەکی بێ باوەڕ

هاوەڵی خۆشەویست صوهەیب (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرموویت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: لە ئوممەتانی پێش ئێوە پادشایەك هەبوو، جا ئەو پادشایە ساحیرێکی هەبوو، کاتێك ساحیرەکە بەساڵدا چوو پیر بوو بە پادشاکەی ووت: من بەساڵدا چووم‌و پیربوومەو مردنیشم نزیك بۆتەوە، لاوێکم بۆ بنێرە بۆئەوەی سیحری فێربکەم، پادشاکە لاوێکی بۆناردو ڕۆژانە لاواکە دەچوو بۆلای ساحیرەکە، لە ڕێگاکەیدا ڕاهیبێك هەبوو، هەرکات لاوەکە دەگەیشتە شوێنی ڕاهیبەکە دادەنیشت‌و گوێی لێ دەگرت‌و قسەکانی لەلا پەسەند بوو، وە هەرکات بهاتایە بۆلای ساحیرەکە لێی دەداو پێی دەووت: بۆ درەنگ هاتووی، لاوەکەش هات بۆلای ڕاهیبەکەو سکاڵای کرد، ڕاهیبەکە ووتی: هەرکات چوویت بۆ لای ساحیرەکە بڵێ ماڵەوە درەنگ ناردومێتی، وە هەرکات گەڕایتەوە بۆ ماڵەوە بڵێ ساحیرەکە درەنگ ناردوومێتیەوە، لاوەکە بەم شێوەیە بەردەوام بوو تاکو ڕۆژێکیان سەیری کرد لەسەر ڕێگای خەڵك ئاژەڵێکی ترسناکی گەورە ڕێگای لە خەڵکی گرتووەو کەس ناتوانێت تێپەڕێت، بۆیە لاوەکە ووتی: ئەمڕۆ دەزانم‌و بۆم دەردەکەوێت کە ئایا بەرنامەو مەنهەجی ساحیرەکە ڕاست‌و ڕەوایە یان بەرنامەو مەنهەجی ڕاهیبەکە، بەردێکی هەڵگرتو ووتی: ئەی پەروەردگار ئەگەر بەرنامەو مەنهەجی ئەو ڕاهیبەت لەلا خۆشەویستترە لەبەرنامەو مەنهجی ئەو ساحیرە، ئەوا بەم بەردە ئەو ئاژەڵە بکوژرێت‌و بمرێت، بەڵکو خەڵکی ڕزگاریان بێت‌و تێپەڕن، لاوەکە بەردەکەی تێگرت‌و ئاژەڵەکەی کوشت، ئینجا خەڵکی

تێپەڕینو ڕزگاریان بوو، لاوەکە بەڕاهیبەکەی ووت: کە ئەو کارەی کردووە، ڕاهیبەکە ووتی: ئەی ڕۆڵە ئەمڕۆ تۆ لەمن باشترو خێرتری لەلای خوا، بەڵام تاقی دەکرێیتەوە، وە ئەگەر تاقی کرایتەوە ناوی منو شوێنی من بەکەس مەڵێ، لاوەکە کوێرو زکماکو نەخۆشی بەڵەکیو هەموو نەخۆشیەك دوعای بۆ دەکردوو بە ئیزنی خوا چاك دەبوونەوە، پادشا وەزیرێکی هەبوو هەردوو چاوی کوێر بوو کاتێك گوێ بیستی ئەوە بوو کە لاوێك هەیە دوعا بۆ کوێر دەکاتو چاك دەبێتەوە، بۆیە دیاریو خەڵاتێکی زۆری لەگەڵ خۆی بردو چوو بۆ لای لاوەکە وە پێی ووت: شیفام بدەو چاوەکانم چاك بکەرەوە، لاوەکە ووتی: من کەس چاك ناکەمەوەو شیفاش لای من نییە بەڵکو تەنها ئەوەی کە شیفای خەڵك دەدات خوای پەروەردگارە، ئەگەر باوەڕی پێبهێنی، ئەوا بۆت دەپاڕێمەوەو خوا شیفات دەدات، وەزیرەکە باوەڕی هێنا بەخوای گەورەو چاوی چاك بووەوە، پاشان وەزیرەکە هات بۆلای پادشاکەو لای دانیشت هەروەك چۆن جاران لەلای دادەنیشت، پادشاکە کەبینی چاوی چاك بۆتەوە بە وەزیرەکەی ووت: کێ چاوەکانی بۆ گێڕایتەوە، وەزیرەکە ووتی: پەروەردگارم، پادشاکە ووتی: جگە لەمن پەروەردگار یکی تر هەیە؟

وەزیرەکە ووتی: پەروەردگاری من وتۆ (الله) یە، ئینجا پادشاکە بەردەوام سزاو ئەشکەنجەی وەزیرەکەی دەدا تاکو وەزیرەکە شوێنی لاوەکەی بە پادشاکە ووت، ئینجا ناردیان بەدوای لاوەکەداو هێنایان بۆلای پادشا، پادشاکە کاتێك کە لاوەکەی بینی پێی ووت: ئەی ڕۆڵە سیحرەکەت گەیشتۆتە ئەو ڕادەیە کوێرو زکماکو نەخۆشی بەڵەکی چاك بکەیتەوە؟

لاوەکە ووتی: من هیچ کەسێك چاك ناکەمەوە، تەنها خوای پەروەردگار شیفای خەڵك دەدات، ئینجا بەردەوام سزاو ئەشکەنجەی لاوەکەیان دەدا تاکو شوێنی ڕاهیبەکەیانی پێ ووت، ئینجا ڕاهیبەکەیان هێناو پێیان ووت: لەو دینەی خۆت پەشیمان ببەوەو بگەڕێوە، ڕاهیبەکە ووتی: پەشیمان نابمەوە، ئینجا مشارێکیان هێناو لەناوەڕاستی سەری دایانو کردیان بەدوو لەتەوە، ئینجا وەزیرەکەیان هێناو پێیان ووت: بگەڕێوەو پەشیمان ببەوە لەو دینە، وەزیرەکە پەشیمان نەبۆیەوە، بەهەمان شێوە وەزیرەکەشیان کرد بەدوو لەتەوە، ئینجا لاوەکەیان هێناو پێیان ووت، بگەڕێوەو پەشیمان ببەوە لەو دینەی کە لەسەریت؟ لاوەکە پەشیمان نەبووەوە، ئینجا پادشاکە فەرمانی کرد کە بیبەن بۆسەر شاخێك، ئەگەر پەشیمان بووەوە، ئەوا بیگەڕێننەوە ئەگەر پەشیمانیش نەبووەوە، ئەوا لەسەر شاخەکەوە بیخەنە خوارەوە، کاتێك کە گەیشتنە سەر شاخەکە لاوەکە لە خوا پاڕایەوەو ووتی: خوایە ڕزگارم بکەی لەدەست ئەمانە بەوەی کە خۆت دەتەوێ، شاخەکە لەژێریان کەوتە لەرزەو کەوتنە خوارەوەو تەنها لاوەکە ڕزگاری بوو، پاشان لاوەکە گەڕایەوە بۆلای پادشاکە، پادشاکە بە لاوەکەی ووت: چیت لەوانە کرد کە تۆیان برد؟ لاوەکە ووتی: ئەو خوایەی کەمن دەیپەرستم ڕزگاری کردم لەدەستی ئەوان، ئەم جارەیان پادشاکە فەرمانی کرد کە بیبەنە ناوەڕاستی دەریا ئەگەر پەشیمان بووەوە، ئەوا بیگەڕێننەوە، ئەگەر پەشیمانیش نەبووەوە، ئەوا بیخەنە ناو دەریاکەوە، دوو بارە لاوەکە لەخوا پاڕایەوە کە ڕزگاری بکات، ووتی: پەروەردگار ڕزگارم بکەی لەدەستیان

بەوەی كە خۆت دەتەوێت، پەروەردگار غەرقیانی كرد، لاوەكە گەڕایەوە بۆلای پادشا كاتێك بینی پێی ووت: چیت لەوانە كرد كەتۆیان برد! لاوەكە ووتی: ئەو خوایەی كەمن دەیپەرستم ڕزگاری كردم لەدەست ئەوان، ئینجا لاوەكە ووتی: تۆ ناتوانی من بكوژی تاكو ئەوەی كە پێت دەڵێم جێبەجێی نەكەی، پادشاكە ووتی: چییە؟ لاوەكە ووتی: خەڵكی كۆبكەرەوە لە یەك جێگەدا، پاشان بەدار خورمایەكەوە بم بەستەرەوە، ئینجا ڕمێك لەڕمەكانم دەربكەو بڵێ: بەناوی خوا خوای ئەو لاوە، پاشان ڕمەكەم تێبگرە، ئەگەر ئەتەوێ بم كوژی، پادشاكە خەڵكی كۆ كردەوەو لاوەكەی بەستەوە بەقەد دارخورمایەكەوە، پاشان لەبەر چاوی خەڵكی ڕمێك لە ڕمەكانی لاوەكەی هەڵگرتو ووتی: بەناوی خوا خوای ئەو لاوە، پادشاكە ڕمەكەی تێگرتو دای لەنێوان گوێی‌و چاوی لاوەكە، ئینجا دەستی خستە سەر شوێنی ڕمەكە تا ڕۆحی دەرچوو مرد، كاتێك خەڵكە ئەوەیان بینی هەموویان ووتیان: باوەڕمان هێنا بە خوای ئەو لاوە، ئینجا بە پادشاكەیان ووت: ئەی پادشا ئەوەی كە تۆ لێی دەترسای ئەوا گەورەتر ڕووی دا! پادشاكە فەرمانی كرد كە چاڵ هەڵبكەنرێتو ئاگری تێدا بكرێتەوە، هەركەسێك پەشیمان بووەوە ئەوا لێی بگەڕێن هەركەسێكیش پەشیمان نەبووەوە، ئەوا بیخەنە ناو ئاگرەكەوە، بەردەوام خەڵكیان دەكردە ناو ئاگرەكەوە تاكو گەیشتە ئافرەتێك منداڵێكی شیرە خۆرەی پێ بوو، بە ئافرەتەكەیان ووت: پەشیمان ببەوە؟ ئافرەتەكە لەبەر منداڵەكەی هەڵوێستەیەكی كرد، بۆیە منداڵەكە بەویست خوا هاتە قسەو بە دایكی ووت: ئەی دایە ئارام بگرە بەڕاستی تۆ لەسەر حەقی .

**چەند سوودو ئامۆژگارییەك لەم چیرۆکەدا.**

(١) هەموو منداڵێك لەسەر فیترەتێکی پاك لەدایك دەبێت .

(٢) سیحر بە فێربوونە، وە ساحیرەکە بە پادشاکەی وت: لاوێکم بۆ بنێرە فێری سیحری دەکەم، بەڵام فێربوون و فێرکردنی بێ باوەڕیە، پەروەردگار دەفەرمووێت: ﴿وَلَٰكِنَّ ٱلشَّيَٰطِينَ كَفَرُواْ يُعَلِّمُونَ ٱلنَّاسَ ٱلسِّحْرَ ﴿١٠٢﴾﴾ سورة البقرة .

**واتە :** بەڵکو شەیتانەکان کافر بوون، چونکە خەڵکیان فێری سیحر دەکرد .

(٣) دروستە بۆ کەسێك درۆ بکات ئەگەر ڕووبەڕوی دوژمن بووەوە لەکاتی زەروریدا، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: درۆ کردن حەڵاڵ نییە بۆ هیچ کەسێك، مەگەر لە سێ کاتدا، لەوانەش: ( وَالْكَذِبُ فِي الْحَرْب ) [1] .

**واتە :** لەکاتی جەنگدا، کاتێك ڕووبەڕووی دوژمن دەبێتەوە، وە ئەو لاوە درۆی لەگەڵ ساحیرەکە دەکرد بۆئەوەی لە فێڵی ڕزگاری بێت .

(٤) پاڕانەوە لە پەروەردگار بۆ ئەوەی ڕاستیو حەقت بۆ ڕوون بکاتەوەو گومانت نەهێڵێت، هەروەك چۆن ئەو لاوە پاڕایەوە لە پەروەردگاری .

(٥) باوەڕداری ڕاستەقینە ئەو کەسەیە کە هۆکارەکان بداتەوە پاڵ پەروەردگار نەك بیداتە پاڵ خۆی بۆ ئەوەی بڵێن پایە بەرزە لە لای خوا .

(٦) زۆر جار ڕێك دەکەوێت تەلەبە لە مامۆستاکەی باشترو چاکتر بێت، ئەگەر چی تەلەبەکەش منداڵ بێت، وە پێویستە مامۆستاکەی دان بەوەدا بنێت، وەك چۆن ڕاهیبەکە وتی: ئەی ڕۆڵە تۆ باشترو خێرتری لەلای خوا وەك لەمن.

---

(١) (صَحِيح) أَخْرَجَهُ التِّرْمِذِيّ فِي السُّنَن (١٩٣٩) وَصَحَّحَهُ الشَّيْخ الأَلْبَانِي فِي صَحِيح الْجَامِع (٧٧٢٣) .

(٧) لابردنی ناڕەحەتی ئازار پێگەیاندن لەسەر ڕێگای خەڵکی، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ( وَإِمَاطَةُ الأَذَى عَنِ الطَّرِيقِ صَدَقَةٌ )[١] .

**واتە :** لابردنی ناڕەحەتیو ئازار پێگەیاندن لەسەر ڕێگا خێرو صەدەقەیە .

(٨) هەرکەسێك فەرمان بە چاکەو ڕێگری لە خراپە بکات، ئەوا بەدڵنیایی تاقی دەکرێتەوە، وە پێویستە لەکاتی تاقیکردنەوەدا خۆگربێت، چونکە پاداشتی گەورە دەدرێتەوە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ( يُبْتَلَى النَّاسَ عَلَى قَدْرِ دِينِهِم فَمَنْ ثَخنَ دِينِه اشْتَدَّ بَلاَؤُهُ وَ مَنْ ضعف دينه ضعف بَلاَؤُهُ )[٢].

**واتە :** خەڵکی تاقی دەکرێتەوە بەئەندازەی ئایینەکەیان، جا هەرکەسێك باوەڕی بەهێزبێت، ئەوا تاقیکردنەوەکەی قورسو گرانە، وە هەرکەسێکیش باوەڕی لاواز بێت، ئەوا تاقیکردنەوەکەی لاوازو ئاسان دەبێت .

(٩) هەرکەسێك هەڵەی کرد لە ووتەدا پێویستە بۆی چاك بکەیتەوە، بەتایبەتی لە بیروباوەڕدا، وەزیرەکە بە لاوەکەی ووت: شیفام بدە ئەویش ووتی: من شیفای هیچ کەسێك نادەم بەڵکو پەروەردگار شیفا دەدات .

(١٠) ئەگەر ڕۆژت تەواو نەبوو بێت، ئەوا هیچ کەسێك ناتوانێت بتکوژێتو تەنانەت زیانیشت پێبگەیێنێت، پادشاکە هەرچەندە هەوڵی دا لاوەکە بکوژێت بەڵام نەی دەتوانی، تاکو خۆی ڕێگەی بە پادشاکە نیشاندا .

---

(١) (صَحِيح) أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُد فِي السُّنَن (١٢٨٥) وَصَحَّحَهُ الشَّيْخ الأَلْبَانِي فِي صَحِيح الْجَامِع (٨٠٩٦) .

(٢) (صَحِيح) أَخْرَجَهُ اِبْن حِبَّانَ فِي صَحِيحه (٢٩٨٢) وَصَحَّحَهُ الشَّيْخ الأَلْبَانِي فِي صَحِيح الْجَامِع (٩٩٣) .

(١١) خۆبەختکردن لە پێناوی خوا، ئەو لاوە لەبەر بەرژەوەندی هەموو خەڵکی ئامادەیە خۆی بەخت بکات، بۆ ئەوەی کە خەڵکی باوەڕبێننو ڕزگاریان بێت لە شیركو نەزانی .

(١٢) خوای گەورە باوەڕداران جێگیرو چەسپاو دەکات لەسەر ئایین، وە دەفەرموێت: ﴿ يُثَبِّتُ اللَّهُ الَّذِينَ ءَامَنُوا بِالْقَوْلِ الثَّابِتِ فِي الْحَيَوٰةِ الدُّنْيَا ﴾سورة ابراهيم.

**واتە:** خوای گەورە باوەڕداران دامەزراوو جێگیر دەکات بە ووتەی ڕاستو ڕەوا لە ژیانی دونیایاندا، وە کاتێك ئەو ئافرەتە سەیری منداڵەکەی دەکات شیرە خۆرەو بێ گوناهە منداڵەکە دێتە قسەو دەڵێت: ئەی دایە خۆگربە تۆ لەسەر حەقی، بۆیە بە خۆیو منداڵەکەیەوە دەچێتە ناو ئاگرەکەوەو گوێی پێ نادات، چونکە لە پێناوی خوای گەورەیە .

(١٣) سەر ئەنجامو چارە نووسی باوەڕداران لە دوای مردنیان بۆ بەهەشتە، وە سەر ئەنجامو چارە نووسی بێ باوەڕەکان بۆ ناو ئاگرو دۆزەخە .

(١٤) باوەڕ پێویستی بە کاتی دوورو درێژ نییە بۆ ئەوەی جێگیربێت لە ناو دڵەکاندا، ئەو قەومەی ڕازی بوون بە ئاگرەکە چەند ساتێك بەسەر باوەڕهێنانەکەیاندا تێ نەپەڕیبوو، وە باوەڕ جێگیر ببوو لە ناو دڵیاندا .

(١٥) توندو تیژی بێ باوەڕان بەرامبەر باوەڕداران، پادشا بێ باوەڕەکە ڕاهیبەکەو وەزیرەکەی بە مشار کردە دوو کەرتەوەو خەڵکەکەی سوتاند .

(١٦) لە ئوممەتانی پێش ئەم ئوممەتە پادشا هەبووە بانگەشەی خوایەتیان کردووەو وتویانە ئێمە خوای خەڵکین، وەك فیرعەونو نەمرودو ئەم پادشایە.

(١٧) جاری واهەیە بەرگە نەگرتنی ئازارو ئەشکەنجە دەبێتە هۆی لاواز بوونی باوەڕ، هەروەها وا لە مرۆڤ دەکات دان بەشتی وادا بنێت کە نابێت بیڵێت، ئەو پیاوەی پەروەردگار چاوەکانی بۆ گێڕایەوە، لە ژێر سزاو ئەشکەنجەدا ناوی منداڵەکەی هێنا، هەروەها منداڵەکەش ناوی ڕاهیبەکەی هێنا، بەڵام سزاو ئەشکەنجە کاری تێنەکردنو پەشیمان نەبوونەوە لە ئاینەکەیان .

(١٨) خوای گەورە بێ باوەڕەکان لاوازو بێ دەسەڵات دەکات بەرامبەر باوەڕداران، وە خوای گەورە ئەو پادشایەی بێ دەسەڵات کردبوو بەرامبەر ئەو منداڵەو نەیدەتوانی بیکوژێت، تاکو خۆی ڕێگەی نیشاندا .

(١٩) خوای پەروەردگار ئەولیاو پیاوچاکانی خۆی دەپارێزێتو سەریان دەخات بەسەر دوژمندا، هەروەکو چۆن ئەو منداڵەی لە کوشتن دەپاراستو دوعاکانی قەبوڵ دەکردو دوژمنەکانی لە ناو دەبرد .

(٢٠) خراپەکاران بەردەوام هەوڵ دەدەن خەڵکی گومڕا بکەن، تەنانەت لە کاتی نزیك بوونەوەی مردنیشیاندا، ساحیرەکە بەپەرۆش بوو لەسەر فێرکردنی ئەو منداڵە بۆ ئەوەی ببێتە میراتگریو لە دوای خۆی خەڵکی پێ گومڕابکاتو لە خوای پەروەردگاریان دوور بخەنەوە .

**ڕونکردنەوەیەك:** خۆ بەختکردن لە پێناوی خوای پەروەردگاردا بریتی نییە لە خۆ کوشتنو خۆ تەقاندنەوە، وە ئەم فەرموودەیەش نابێت بەبەڵگە لەسەر ئەنجامدانی ئەو کارە، ئەو لاوەی لەم فەرموودەیەدا باسکراوە ڕێنموونی پادشاکە دەکات بۆ ئەو ڕێگەیەی کە پێی دەکوژرێت، چونکە بەرژەوەندی گشتی تێدایە، بەوەی ئەو خەڵکە هەموویان چوونە سەر ئاینی لاوەکە، وە لە دۆزەخ ڕزگاریانی کردوو بەرەو بەهەشت بەڕێیانی کرد، بەڵام ئەوەی کە خۆی دەتەقێنێتەوە خەڵکی بەرەو دۆزەخ بەڕێ دەکات ئەگەر کافر بن، وە ئەگەر موسڵمان بن، ئەوا بەناحەق دەیان کوژێتو ڕوو بەڕووی سزای خوای گەورە دەبێتەوە .

## القِصَّة السَّادسة: الرَّجُل الَّذِي دَخَلَ الجَنَّةَ في كلبٍ سَقَاهُ

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: « بَيْنَمَا رَجُلٌ يَمْشِي بِطَرِيقٍ اشْتَدَّ عَلَيْهِ الْعَطَشُ فَوَجَدَ بِئْرًا فَنَزَلَ فِيهَا فَشَرِبَ ثُمَّ خَرَجَ فَإِذَا كَلْبٌ يَلْهَثُ يَأْكُلُ الثَّرَى مِنَ الْعَطَشِ فَقَالَ الرَّجُلُ: لَقَدْ بَلَغَ هَذَا الْكَلْبَ مِنَ الْعَطَشِ مِثْلُ الَّذِي كَانَ بَلَغَ مِنِّي، فَنَزَلَ الْبِئْرَ فَمَلأَ خُفَّهُ مَاءً ثُمَّ أَمْسَكَهُ بِفِيهِ حَتَّى رَقِيَ فَسَقَى الْكَلْبَ فَشَكَرَ اللَّهُ لَهُ فَغَفَرَ لَهُ» قَالُوا يَا رَسُولَ اللَّهِ وَإِنَّ لَنَا فِي هَذِهِ الْبَهَائِمِ لأَجْرًا فَقَالَ «فِي كُلِّ كَبِدٍ رَطْبَةٍ أَجْرٌ»[1].

**چیرۆکی شەشەم: ئەو پیاوەی چووە بەهەشتەوە لەبەر ئەوەی سەگێکی تێر ئاوکرد**

هاوەڵی خۆشەویست ئەبو هورەیرە (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمووێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: پیاوێك بە ڕێگایەکدا دەڕۆیشت زۆری تینو بوو بیرێکی دۆزییەوە ئاوی تێدابوو، ئینجا دابەزییە ناو بیرەکەو ئاوی خواردو پاشان هاتە دەرەوە، سەگێکی بینی زمانی دەرهێناوەو هەناسە برکێیەتی‌و لە تینوداو خۆڵ دەخوات، پیاوەکە ووتی: بەڕاستی ئەم سەگە وەك منی لێ بەسەر هاتووە، ئینجا پیاوەکە دووبارە چووە ناوبیرەکەوەو پێڵاوەکەی پڕکرد لەناو بەدەمی گرتی تاکو هاتە دەرەوەی بیرەکە، جا ئاوەکەی دا بە سەگەکەو تێر ئاوی کرد، خوای گەورە ئەو کارەی لێوەرگرتو سوپاسی کردو لێی خۆشبوو، ووترا: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) چاکە کردن لەگەڵ ئاژەڵ وئاودانی پاداشتی هەیە؟ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: بۆ هەموو ئاژەڵێکی زیندوو پاداشتو ئەجر هەیە ( هەموو خاوەن جگەرێك ) .

---

(١) أخرجَهُ البُخارِيُّ (٦٠٠٩)، ومُسْلِمٌ (٥٨٢٠) .

**چەند سوودو ئامۆژگارییەك لەم چیرۆکەدا.**

(١) بەخشندەیی و لێبووردەیی و فراوانی ڕەحمەتی خوای پەروەردگار، پاداشتێکی زۆر گەورە دەداتەوە لەسەر کردەوەیەکی کەم .

(٢) ئاو نیعمەتێکی پەروەردگارەو مرۆڤ و ئاژەڵ بەبێ ئاو ناتوانن بژین .

(٣) ئاو بەخشین خێرو صەدەقەیە، سەعدی کوڕی عوبادە (رضي الله عنه) فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) دایکم مرد ئایا چی بۆ بکەم بەخێر؟ فەرمووی: ئاوی بۆ بکە بەخێر، ئەویش چوو بیرێکی لێداو فەرمووی: ئەمە بۆدایکم[١] .

(٤) بەندەیەك بەهۆی ئەوەی سەگێکی تێر ئاوکرد چووە بەهەشتەوە، ئەی ئەگەر مرۆڤێك تێر ئاو بکرێت دەبێت خێرو پاداشتی چی بێت؟

(٥) ئاودان و تێرکردنی ئاژەڵ و پاراستنی لەسەرماو گەرما خێرەو پاداشتی لەسەرە، زانایان دەفەرموون: بەمەرجێك ئەو ئاژەڵە زیان بەخش نەبێت .

(٦) هەندێك لەزانایان دەفەرموون ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە دروستە سەفەرکردن بەتەنها، ئەگەر زانی توشی ناڕەحەتی و هیلاکەت نابێت.

(٧) ئاو بەخشین لەبەر ڕەزامەندی پەروەردگار یەکێکە لە کردەوە چاکەکان، هەندێك لە پێشینەکان فەرموویانە: ( مَنْ كَثرت ذنوبه فَعَليه بِسقي الماء )[٢] .

واتە: هەر کەسێك تاوان و گوناهی زۆرە با ئاو بکات بەخێرو بیبەخشێت .

---

(١) (حَسَن) أخرَجَهُ ابن مَاجَة وَالنسائي، وَحَسَّنَهُ الشَّيخ الألبَاني فِي صَحِيح الجَامِع (١١١٣) .

(٢) عمدة القاري شَرح صَحِيح البُخَارِيُّ (٥٢/١٩)، شَرح البُخَارِيُّ لابن بطال (٢٠/١٢) .

## القِصَّة السَّابِعَة: الأَبْرَصَ وَالأَعْمَى وَالأَقْرَع الَّذين ابتَلاَهُمُ اللهُ

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) قَالَ: قَالَ: رَسُولَ اللَّـهِ (ﷺ) « إِنَّ ثَلاَثَـةً فِـي بَنِـي إِسْرَائِيلَ أَبْرَصَ وَأَقْرَعَ وَأَعْمَى بَدَا لِلَّـهِ أَنْ يَبْتَلِـيَهُمْ، فَبَعَـثَ إِلَـيْهِمْ مَلَكًـا، فَأَتَى الأَبْرَصَ، فَقَالَ أَيُّ شَيْءٍ أَحَبُّ إِلَيْكَ قَالَ لَـوْنٌ حَـسَنٌ وَجِلْـدٌ حَـسَنٌ، قَدْ قَذِرَنِي النَّاسُ، قَالَ فَمَسَحَهُ، فَذَهَبَ عَنْهُ، فَـأُعْطِيَ لَوْنًـا حَـسَنًا وَجِلْـدًا حَسَنًا، فَقَالَ أَيُّ الْمَالِ أَحَبُّ إِلَيْكَ قَالَ الإِبِلُ أَوْ قَالَ الْبَقَـرُ هُـوَ شَـكَّ فِـي ذَلِكَ، إِنَّ الأَبْرَصَ وَالأَقْرَعَ، قَـالَ أَحَـدُهُمَا الإِبِـلُ، وَقَـالَ الآخَـرُ الْبَقَـرُ فَأُعْطِيَ نَاقَةً عُشَرَاءَ، فَقَالَ يُبَارَكُ لَكَ فِيهَا، وَأَتَـى الأَقْـرَعَ فَقَـالَ أَيُّ شَـيْءٍ أَحَبُّ إِلَيْكَ قَالَ شَعْرٌ حَسَنٌ، وَيَذْهَبُ عَنِّي هَذَا، قَـدْ قَـذِرَنِي النَّـاسُ، قَـالَ فَمَسَحَهُ فَذَهَبَ، وَأُعْطِيَ شَعْرًا حَسَنًا، قَالَ فَأَيُّ الْمَـالِ أَحَـبُّ إِلَيْـكَ قَـالَ الْبَقَرُ، قَالَ فَأَعْطَاهُ بَقَرَةً حَامِلاً، وَقَالَ يُبَارَكُ لَكَ فِيهَا، وَأَتَـى الأَعْمَـى فَقَـالَ أَيُّ شَيْءٍ أَحَبُّ إِلَيْكَ قَالَ يَرُدُّ اللَّهُ إِلَيَّ بَـصَرِي، فَأُبْـصِرُ بِـهِ النَّـاسَ، قَـالَ فَمَسَحَهُ، فَرَدَّ اللَّهُ إِلَيْهِ بَصَرَهُ، قَالَ فَأَيُّ الْمَـالِ أَحَـبُّ إِلَيْـكَ قَـالَ الْغَـنَمُ، فَأَعْطَاهُ شَاةً وَالِدًا، فَأُنْتِجَ هَذَانِ، وَوَلَّدَ هَـذَا، فَكَـانَ لِهَـذَا وَادٍ مِـنْ إِبِـلٍ، وَلِهَذَا وَادٍ مِنْ بَقَرٍ، وَلِهَذَا وَادٍ مِنَ الْغَنَمِ، ثُمَّ إِنَّهُ أَتَـى الأَبْـرَصَ فِـي صُـورَتِهِ وَهَيْئَتِهِ فَقَالَ رَجُلٌ مِسْكِينٌ، تَقَطَّعَتْ بِيَ الْحِبَـالُ فِـي سَـفَرِي، فَـلاَ بَـلاَغَ الْيَوْمَ إِلاَّ بِاللَّهِ ثُمَّ بِكَ، أَسْـأَلُكَ بِالَّـذِي أَعْطَـاكَ اللَّـوْنَ الْحَـسَنَ وَالْجِلْـدَ الْحَسَنَ وَالْمَالَ بَعِيرًا أَتَبَلَّغُ عَلَيْهِ فِي سَفَرِي، فَقَـالَ لَـهُ إِنَّ الْحُقُـوقَ كَـثِيرَةٌ، فَقَالَ لَهُ كَأَنِّي أَعْرِفُكَ، أَلَمْ تَكُنْ أَبْرَصَ يَقْذَرُكَ النَّـاسُ فَقِـيرًا فَأَعْطَـاكَ اللَّـهُ

فَقَالَ لَقَدْ وَرِثْتُ لِكَابِرٍ عَنْ كَابِرٍ، فَقَالَ إِنْ كُنْتَ كَاذِبًا فَصَيَّرَكَ اللَّهُ إِلَى مَا كُنْتَ، وَأَتَى الأَقْرَعَ فِي صُورَتِهِ وَهَيْئَتِهِ، فَقَالَ لَهُ مِثْلَ مَا قَالَ لِهَذَا، فَرَدَّ عَلَيْهِ مِثْلَ مَا رَدَّ عَلَيْهِ هَذَا فَقَالَ إِنْ كُنْتَ كَاذِبًا فَصَيَّرَكَ اللَّهُ إِلَى مَا كُنْتَ، وَأَتَى الأَعْمَى فِي صُورَتِهِ فَقَالَ رَجُلٌ مِسْكِينٌ وَابْنُ سَبِيلٍ وَتَقَطَّعَتْ بِيَ الْحِبَالُ فِي سَفَرِي، فَلاَ بَلاَغَ الْيَوْمَ إِلاَّ بِاللَّهِ ثُمَّ بِكَ، أَسْأَلُكَ بِالَّذِي رَدَّ عَلَيْكَ بَصَرَكَ شَاةً أَتَبَلَّغُ بِهَا فِي سَفَرِي، فَقَالَ قَدْ كُنْتُ أَعْمَى فَرَدَّ اللَّهُ بَصَرِي، وَفَقِيرًا فَقَدْ أَغْنَانِي، فَخُذْ مَا شِئْتَ، فَوَاللَّهِ لاَ أَجْهَدُكَ الْيَوْمَ بِشَيْءٍ أَخَذْتَهُ لِلَّهِ، فَقَالَ أَمْسِكْ مَالَكَ، فَإِنَّمَا ابْتُلِيتُمْ، فَقَدْ رَضِيَ اللَّهُ عَنْكَ وَسَخِطَ عَلَى صَاحِبَيْكَ »[1] .

**چیرۆکی حەوتەم: بەڵەکێك و کەچەڵێك و کوێرێك ئەوانەی پەروەردگار تاقیانیکردەوە**

هاوەڵی خۆشەویست ئەبو هورەیرە (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمووێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: سێ کەس هەبوون لە ئوممەتانی پێش ئێوە (لەبەنی ئیسرائیل) ئەو سێ کەسە: بەڵەکێك و کەچەڵێك و کوێرێك، خوای گەورە ویستی وابوو کە تاقییان بکاتەوە، بۆیە مەلائیکەتێکی نارد بۆلایان، مەلائیکەتەکە هات بۆلای پیاوە بەڵەکەکەو پێی ووت: چ شتێك لەلای تۆ زۆر باش و خۆشەویستە (واتە: حەزو ئارەزو لە چ شتێك دەکەیت؟) پیاوە بەڵەکەکە ووتی: ڕەنگ و ڕوویەکی چاك و جوان و پێستێکی چاك،

---

(١) أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ (٣٤٦٤)، وَمُسْلِمٌ (٧٣٥٧) .

چونکە بەڕاستی خەڵکی لێم بێزار بوونەو حەزیان پێم نییەو حەزناکەن بم بینن، مەلائیکەتەکە دەستی بە لاشەیدا هێناو بەڵەکیەکەی چاك بووەو ڕەنگی گۆڕا بوو بە مرۆڤێکی ڕەنگ جوان‌و پێست چاك‌و باش، پاشان مەلائیکەتەکە پێی ووت: چ سامان‌و ماڵێك لەلای تۆ لەهەموویان خۆشەویستترە؟ ئەویش ووتی: (وشتر یان مانگا)، مەلائیکەتەکە وشترێکی ئاوسی سك پڕی پێداو ووتی: پەروەردگار فەرداری بکات، ئینجا مەلائیکەتەکە ڕۆیشت‌و چوو بۆلای پیاوە کەچەڵەکەو پێی ووت: چ شتێك لەلای تۆ باش‌و خۆشەویستە (واتە: حەزو ئارەزو لە چ شتێك دەکەیت؟) پیاوە کەچەڵەکە ووتی: قژێکی جوان‌و لەم کەچەڵییە ڕزگارم ببێت، چونکە بەڕاستی خەڵکی لێم بێزار بوونەو حەزیان پێم نییەو حەزناکەن بم بینن، مەلائیکەتەکە دەستی بە سەریدا هێناو کەچەڵییەکەی چاك بووەوەو بوو بە کەسێکی قژ جوان، پاشان مەلائیکەتەکە پێی ووت: چ سامان‌و ماڵێك لەلای تۆ لەهەموویان خۆشەویستترە؟ ئەویش ووتی: مانگا، مەلائیکەتەکەش مانگایەکی ئاوسی سك پڕی پێداو ووتی: خوای پەروەردگار فەرداری بکات، ئینجا مەلائیکەتەکە ڕۆیشت‌و چوو بۆلای پیاوە کوێرەکەو پێی ووت: چ شتێك لەلای تۆ باش‌و خۆشەویستە (واتە: حەزو ئارەزو لە چ شتێك دەکەیت؟) پیاوە کوێرەکە ووتی: خوای پەروەردگار چاوەکانم بۆ بگێڕێتەوە، بۆ ئەوەی خەڵکی پێ ببینم، ئینجا مەلائیکەتەکە دەستی هێنا بەسەر چاوەکانیدا، وە

خـوای گـەورە هـەردوو چـاوی بـۆ گێڕایـەوە، پاشـان مەلائیکەتەکـە بـە پیـاوە کوێرەکـەی ووت: چ مـاڵو سـامانێك لـەلای تـۆ لەهـەموویان خۆشەویستترە؟ ئـەویش ووتـی: مـەڕ، مەلائیکەتەکـە مـەڕێکی ئاوسـی سـك پـڕی پێـدا، پاشـان خـاوەن وشـترو مانگاکـە بەرهـەمێکی زۆری لێکەوتـەوە بـە فـەزڵی خـوای گـەورە، وە خـاوەن مەڕەکـەش بەوێنـەی ئـەوان، ئینجـا پیـاوە بەڵەکەکـە بـوو بـەخاوەن دۆڵێـك وشـتر، وە پیـاوە کەچـەڵکە بـوو بـەخاوەنی دۆڵێـك مانگـا، وە پیـاوە کوێرەکـە بـوو بـە خـاوەنی دۆڵێـك مـەڕ، پـاش ماوەیـەك مەلائیکەتەکـە هـات بـۆلای پیـاوە بەڵەکەکـە لەسـەر ئـەو شـێوەیەی کـە پێـشتر هـاتبوو بـۆلای ( بۆئـەوەی حوجـەی نـەمێنێت )، پێـی ووت: پیـاوێکی هـەژارو ڕێبـوارم هـیچ شـتێکم پـێ نـەماوە بـۆ پەیـداکردنی خـۆراك وە بۆگەیـشتنەوەم بـە شـوێنی خـۆم، جـا هـیچ کەسێك ناتوانێـت مـن بگەێنێتـەوە شـوێنی خـۆم جگـە لـە خـوای گـەورەو پاشـان تـۆ، جـا داوات لێدەکـەم تـو ئـەو خوایـەی کـە ئـەو ڕەنـگو ڕووە جـوان و پێـستە چـاکەی پێـداویو مـاڵ وسـامانی پـێ بەخـشیووی، وشترێکم پێ بدە بۆ ئەوەی بگەمەوە شوێنی خۆم؟

پیـاوە بەڵەکەکـە لەوەڵامـدا ووتـی: بەڕاسـتی مافـەکان زۆرنو ئـەرکی زۆرم بەسەرەوەیە ناتوانم وشترێکت پێبدەم، یان مافەکان زۆرن تـۆ وشـترێکت بـەر ناکەوێت، پیاوە بەڵەکەکە مەبەستی ئەوە بوو بـەڕێی بکـاتو هیـچی نـەداتێ، مەلائیکەتەکە پێی ووت: وەك ئەوە وایە بـت ناسـم، ئایـا تـۆ پیـاوێکی بەڵـەك نەبووی خەڵکی حەزیان بە بینینت نەبوو، وە لێت بێزار ببوونو بێزیـان لێـت

دەکردەوە؟ وە هەژار بوویت خوای پەروەردگار دەوڵەمەندی کردی بوویتە بـە خاوەنی ئەمماڵو سامانە زۆرە، پیاوە بەڵەکەکە وتی: ئەم ماڵو سـەروەتەم لـە بـاو باپیرانـەوە بـۆ ماوەتـەوەو دەسـت بـە دەسـت گەیـشتووە بـەمن، مەلائیکەتەکە ووتی: ئەگەر درۆ دەکەیت خوای گەورە وەك خۆت لێ بکاتـەوە، پاشان مەلائیکەتەکە هات بۆلای کەچـەڵەکە لەسـەر ئـەو شـێوەیەی کەپێـشتر هـاتبوو بـۆلای، ئـەوەی بـە بەڵەکەکـەی ووتبـوو بـە کەچەڵەکەشـی ووت، کەچەڵەکە بەهەمان شێوەی بەڵەکەکە وەڵامی دایـەوە، مەلائیکەتەکـە ووتـی: ئەگەر درۆ دەکـەی خـوا وەك خـۆت لێ بکاتـەوە، پاشـان مەلائیکەتەکـە هـات بۆلای پیاوە کوێرەکە لەسەر شێوەی یەکەم جار کە هاتبوو بۆلایو پێـی وت: پیاوێکی هەژارو رێبـوارمو هـیچ شـتێکم پـێ نـەماوە بـۆ پەیـداکردنی خـۆراكو گەیشتنەوەم بـە شـوێنی خـۆم، جـا هـیچ کەسـێك ناتوانێـت مـن بگەێنێتـەوە شوێنی خۆم جگە لە خوای گـەورەو پاشـان تـۆ، جـا داوات لێدەکـەم تـو ئـەو خوایەی کە چاوەکانی بـۆ گێڕایتـەوە مـەڕێکم پـێ بـدە بـۆ ئـەوەی بگەمـەوە شـوێنی خـۆم؟ پیـاوە کوێرەکـە لـە وەڵامـدا ووتـی: مـن کـوێرو نابینـا بـووم پەروەردگار چاوی بۆ گێڕامەوە، هەژار بووم پەروەردگار دەوڵەمەنـدی کـردم، چیت پێویستە بۆخۆت ببە، سـوێند بـەخوا دەسـت ناهێنمـە رێـت ئـەمڕۆ بـە ئارەزووی خۆت چی دەبەی ببە لە رێی خوا، مەلائیکەتەکە پێـی ووت: مـاڵی خۆت بگرە بۆخۆت، ئێوە تاقیکرانـەوە، بەڕاسـتی خـوای پـەروەردگار لـە تـۆ ڕازی بوو، وە خەشم وقینی گرت لە دوو هاوەڵەکەت .

**چەند سوودو ئامۆژگارییەك لەم چیرۆکەدا.**

(١) تاقیکردنەوەی پەروەردگار بۆ بەندەکانی، بۆ ئەوەی دەر بکەوێت کێ شوکرانەی خوای پەروەردگار دەکات لەسەر نیعمەتەکان .

(٢) هەندێك جار مەلائیکەتەکان لەسەر شێوەی مرۆڤ دێن بۆلای بەندەکانو قسەیان لەگەڵدا دەکەنو شیفای نەخۆش دەدەن بە فەرمانی پەروەردگار.

(٣) خوای پەروەردگار بەرەکەت بخاتە ماڵی هەر کەسێکەوە، ئەوا ئەو ماڵە گەشە دەکاتو زیاد دەکات .

(٤) دەوڵەمەندی بەڵگە نییە لەسەر ئەوەی خوا ئەو کەسەی خۆش دەوێت، بەڵکو هەرکەسێك دەوڵەمەند بێت، ئەوا خوای پەروەردگار تاقی دەکاتەوە .

(٥) هیچ شتێك نییە بەلای نەخۆشەوە خۆشتربێت لەوەی خوا شیفای بدات .

(٦) تەنها خوا دەبەخشێتو دەگرێتەوەو دەوڵەمەندیو هەژاری بەدەست ئەوە.

(٧) لە نیشانەو ئەدەبی خواپەرستی ئەوەیە شیفا بگێڕدرێتەوە بۆلای خوا، پیاوە کویرەکە ووتی: من کوێرو نابینا بووم پەروەردگار چاوی بۆ گێڕامەوە .

(٨) مرۆڤی نەزان بەخیل دەبێت لەکاتی دەوڵەمەندیدا، وە مرۆڤی ژێر ئەوکەسەیە دەستکراوە بێت لە بەخشین لە ڕێگەی خوای پەروەردگاردا .

(٩) لەناو خەڵکیدا کەسانێك هەن بیریان چۆتەوە کە پێشتر هەژار بوونە، وە پێشیان ناخۆشە یادیان بخرێتەوە .

(١٠) هەرکەسێك سوپاسی پەروەردگار بکات لەسەر نیعمەتەکانو ببەخشێت لە ڕێگەی ئەودا، ئەوا پەروەردگار زیاتری پێدەبەخشێت، وە هەرکەسێك بەخیلی بکات، ئەوا ماڵەکە بەهەدەری دەداتو پەروەردگار لێی تورە دەبێت.

(١١) بەخشین لە ڕێگەی خوادا دەبێتە هۆی ڕازی بوونی خوای پەروەردگار، وە بەخیلیو دەستگرتنەوە دەبێتە هۆی توڕەیی خوای گەورە .

(١٢) سوپاسی نیعمەتەکان بەگوێرەی خۆیانە: سوپاسیماڵو سامان ئەوەیە کە بیەخشیت لەبەر ڕەزامەندی پەروەردگار، وە سوپاسی زانستو زانیاری ئەوەیە کاتێك پرسیارت لێ دەکرێت ڕاستیو حەق بڵێیت .

(١٣) ( الصَّاحِب) هاوەڵەکەت تەنها بەکار نایات بۆ کەسێکی نزیك، بەڵکو بۆ کەسێکیش بەکاردێت کە لە حاڵی ئەو بچێت، وە مەلائیکەتەکە بەکوێرەکەی ووت: ئێوە تاقیکرانەوە بەڕاستی پەروەردگار لە تۆ ڕازی بوو، وە خەشمو قینی گرت لە دوو هاوەڵەکەت .

(١٤) زانای پایەبەرز شێخ (ابن عُثيمين)[1] دەفەرمووێت: مرۆڤەکان ڕازی نین بە قەزاو قەدەری پەروەردگار، ئەو سێ کەسە کە توشی بەڵاو نەخۆشی ببوون دەیان ووت: فڵانە ماڵو سامان لەلای من لەهەموویان خۆشەویستترە؟ ئەمیش پێچەوانەی ڕازی بوونە بە قەزاو قەدەر، وە بێگومان مرۆڤەکان لەکاتی بەڵاو موسیبەتو نارەحەتی دا چوار جۆرن:

بێ ئارامە: کەئەمیش حەرامە .

ئارامگرە: کەئەمیش واجبە .

ڕازییە: کەئەمیش موستەحەبە .

سوپاس گوزارە: کە ئەمیش چاكو باشە .

---

(١) بڕوانە: القول المفيد شرح كتاب التوحيد .

## القِصَّة الثَّامِنَة: الرَّجُلُ الَّذِي اشْتَرَى عَقَاراً وَفِي عَقَارِهِ جَرَّةٌ فِيهَا ذَهَب

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) قَالَ: قَالَ: رَسُولَ اللَّه (ﷺ) اشْتَرَى رَجُلٌ مِنْ رَجُلٍ عَقَارًا لَهُ فَوَجَدَ الرَّجُلُ الَّذِي اشْتَرَى الْعَقَارَ فِي عَقَارِهِ جَرَّةً فِيهَا ذَهَبٌ فَقَالَ لَهُ الَّذِي اشْتَرَى الْعَقَارَ خُذْ ذَهَبَكَ مِنِّي إِنَّمَا اشْتَرَيْتُ مِنْكَ الأَرْضَ وَلَمْ أَبْتَعْ مِنْكَ الذَّهَبَ. فَقَالَ الَّذِي شَرَى الأَرْضَ إِنَّمَا بِعْتُكَ الأَرْضَ وَمَا فِيهَا قَالَ: فَتَحَاكَمَا إِلَى رَجُلٍ فَقَالَ الَّذِي تَحَاكَمَا إِلَيْهِ أَلَكُمَا وَلَدٌ فَقَالَ أَحَدُهُمَا لِي غُلاَمٌ وَقَالَ الآخَرُ لِي جَارِيَةٌ. قَالَ أَنْكِحُوا الْغُلاَمَ الْجَارِيَةَ وَأَنْفِقُوا عَلَى أَنْفُسِكُمَا مِنْهُ وَتَصَدَّقَا )[1] .

**چیرۆکی هەشتەم: ئەو پیاوەی زەویەکی کڕی و لەزەوییەکەدا گۆزەیەك ئاڵتونی تێدابوو**

هاوەڵی خۆشەویست ئەبو هورەیرە (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمووێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: پیاوێك خانوویەك یان زەوی لەپیاوێکی تر کڕی، ئەو پیاوەی کە زەویەکەی کڕیبوو گۆزەیەك ئاڵتونی لە زەوییەکەدا دۆزییەوە، ئینجا پیاوە کڕیارەکە بە پیاوە فرۆشیارەکەی ووت: ئاڵتوونەکەت ببەوە لەلای من، چونکە من زەویم لە تۆ کڕیوە نەك ئاڵتوون، پیاوە فرۆشیارەکە ووتی: من زەویەکەو ئەوەی کەتێیدایە بەتۆم فرۆشتووە، پاشان هاتن بۆلای دادوەرێك بۆ ئەوەی چارەسەرێکیان بۆ بدۆزێتەوە، دادوەرەکە ووتی: ئایا منداڵتان هەیە؟ یەکێکیان ووتی: من کوڕێکم هەیە، ئەوەی تریشیان ووتی: منیش کچێکم هەیە، ئینجا پیاوە دادوەرەکە ووتی: کەواتە تۆ کچەکەت بدە بە کوڕەکەو ئەو ماڵە خەرج بکەن بۆیان و خێریشی لێبکەن .

---

(١) أخرجه البخاري (٣٤٧٢)، ومسلم (٤٤٧٢) .

**چەند سوودو ئامۆژگارییەك لەم چیرۆکەدا.**

**(١) بوونی پیاو چاکانو لە خوا ترسو بە پەرۆش لە هەموو سەردەمێکدا لەسەر بە دەست هێنانی ماڵی حەڵاڵ، هەروەها دوور کەوتنەوە لە حەرام .**

**(٢) پێویستە ئەمانەت بگێڕدرێتەوە بۆ خاوەنەکەی، چونکە پەروەردگار فەرمانی پێکردووین ئەمانەتو سپاردەکان بگێڕینەوە بۆ خاوەنەکانیان .**

**(٣) قەناعەتو ڕازی بوون ماڵو سەروەتێکە بێ کۆتاییە، وە بەخێرو بەرەکەت دەگەڕێتەوە بۆ خاوەنەکەی .**

**(٤) هەرکەس ڕازی بێت بەوەی خوا پێی بەخشیوە، ئەوا دەوڵەمەندترین کەسە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (وَارْضَ بِمَا قَسَمَ اللَّهُ لَكَ تَكُنْ أَغْنَى النَّاسِ)[١]**

**واتە: وە ڕازیبە بەو بەشەی پەروەردگار بۆی داناوی دەوڵەمەندترین کەسی.**

**(٥) ڕزقو ڕۆزی دابەشکراوە، هەردەبێت پێت بگات لەکاتو شوێنی خۆیدا، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ( لَوْ أَنَّ ابْنَ آدَمَ هَرَبَ مِنْ رِزْقِهِ كَمَا يَهْرُبُ مِنْ الْمَوْتِ لأَدْرَكَهُ رِزْقه كَمَا يُدْرِكُهُ الْمَوْت )[٢] .**

**واتە: ئەگەر ئادەمیزاد ڕابکات لەڕزقو ڕۆزییەکەی وەکو چۆن لە مردن ڕادەکات، ئەوا ڕزقو ڕۆزییەکەی دەیگرێتەوە وەکو چۆن مردن دەیگرێتەوە.**

**(٦) پێویستە موسڵمان ڕازی بێت بە حەڵاڵ، هەروەها دووربکەوێتەوە لە حەرامو هۆکاری خراپ بۆ بەدەست هێنانی ڕزقو ڕۆزی .**

---

(١) (حَسَن) أَخرَجَهُ التِّرمِذيّ فِي السُّنن (٢٣٠٥)، وَحَسَّنَهُ الشَّيخ الأَلبَاني فِي صَحِيح الجَامِع (١٠٠) .

(٢) (صَحِيح) صَحَّحَهُ الشَّيخ الأَلبَاني فِي صَحِيح الجَامِع (٥٢٤٠)، وَفِي سِلسِلَة الأَحادِيث الصَّحِيحَة (٩٥٢) .

## القِصَّة التَاسِعَة: الرَّجُلُ الَّذِى اسْتَلَف أَلف دِينَار

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) عَنْ رَسُولِ اللَّه (ﷺ) « أَنَّهُ ذَكَرَ رَجُلاً مِنْ بَنِي إِسْرَائِيلَ سَأَلَ بَعْضَ بَنِي إِسْرَائِيلَ أَنْ يُسْلِفَهُ أَلْفَ دِينَارٍ، فَقَالَ ائْتِنِي بِالشُّهَدَاءِ أُشْهِدُهُمْ، فَقَالَ كَفَى بِاللَّهِ شَهِيدًا، قَالَ فَأْتِنِي بِالْكَفِيلِ، قَالَ كَفَى بِاللَّهِ كَفِيلاً، قَالَ صَدَقْتَ، فَدَفَعَهَا إِلَيْهِ إِلَى أَجَلٍ مُسَمًّى، فَخَرَجَ فِي الْبَحْرِ، فَقَضَى حَاجَتَهُ، ثُمَّ الْتَمَسَ مَرْكَبًا يَرْكَبُهَا، يَقْدَمُ عَلَيْهِ لِلأَجَلِ الَّذِى أَجَّلَهُ، فَلَمْ يَجِدْ مَرْكَبًا، فَأَخَذَ خَشَبَةً، فَنَقَرَهَا فَأَدْخَلَ فِيهَا أَلْفَ دِينَارٍ، وَصَحِيفَةً مِنْهُ إِلَى صَاحِبِه، ثُمَّ زَجَّجَ مَوْضِعَهَا، ثُمَّ أَتَى بِهَا إِلَى الْبَحْرِ، فَقَالَ اللَّهُمَّ إِنَّكَ تَعْلَمُ أَنِّى كُنْتُ تَسَلَّفْتُ فُلانًا أَلْفَ دِينَارٍ، فَسَأَلَنِي كَفِيلاً، فَقُلْتُ كَفَى بِاللَّه كَفِيلاً، فَرَضِيَ بِكَ، وَسَأَلَنِي شَهِيدًا، فَقُلْتُ كَفَى بِاللَّه شَهِيدًا، فَرَضِيَ بِكَ، وَأَنِّى جَهَدْتُ أَنْ أَجِدَ مَرْكَبًا، أَبْعَثُ إِلَيْهِ الَّذِى لَهُ فَلَمْ أَقْدِرْ، وَإِنِّى أَسْتَوْدِعُكَهَا، فَرَمَى بِهَا فِي الْبَحْرِ حَتَّى وَلَجَتْ فِيه، ثُمَّ انْصَرَفَ، وَهُوَ فِي ذَلِكَ يَلْتَمِسُ مَرْكَبًا، يَخْرُجُ إِلَى بَلَدِه، فَخَرَجَ الرَّجُلُ الَّذِى كَانَ أَسْلَفَهُ، يَنْظُرُ لَعَلَّ مَرْكَبًا قَدْ جَاءَ بِمَالِه، فَإِذَا بِالْخَشَبَةِ الَّتِي فِيهَا الْمَالُ، فَأَخَذَهَا لأَهْلِه حَطَبًا، فَلَمَّا نَشَرَهَا وَجَدَ الْمَالَ وَالصَّحِيفَةَ، ثُمَّ قَدِمَ الَّذِى كَانَ أَسْلَفَهُ، فَأَتَى بِالأَلْفِ دِينَارٍ، فَقَالَ وَاللَّه مَا زِلْتُ جَاهِدًا فِي طَلَبِ مَرْكَبٍ لآتِيَكَ بِمَالِكَ، فَمَا وَجَدْتُ مَرْكَبًا قَبْلَ الَّذِى أَتَيْتُ فِيه، قَالَ هَلْ كُنْتَ بَعَثْتَ إِلَيَّ بِشَيْءٍ قَالَ أُخْبِرُكَ أَنِّى لَمْ أَجِدْ مَرْكَبًا قَبْلَ الَّذِى جِئْتُ فِيه، قَالَ فَإِنَّ اللَّهَ قَدْ أَدَّى عَنْكَ الَّذِى بَعَثْتَ فِي الْخَشَبَةِ فَانْصَرِفْ بِالأَلْفِ الدِّينَارِ رَاشِدًا »[1].

---

(١) أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ (٢٢٩١) .

## چیرۆکی نۆیەم: ئەو پیاوەی هەزار دیناری بە قەرز وەرگرت

هـاوەڵی خۆشەویـست ئـەبو هـورەیرە (خـوای لێ ڕازی بێـت) دەفـەرمووێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: پیاوێك هەبوو لە ئوممەتانی پـێش ئێـوە پرسیاری دەکرد بۆ ئەوەی کە یەکێك هەزار دینـاری بـداتێ بەقـەرز، پیـاوێکی دۆزییەوە، پیاوەکە پێی ووت: چـەند شـایەتێکم بۆبێنـە شـایەتیت بـۆ بـدەن، ئـەویش ووتـی: خـوای گـەورە بەسـە کـە شـایەت بێـت لـە نێـوان مـنو تـۆدا، پیاوەکە ووتی: کەفیلم بۆ بێنە کەسێك تۆ لـە ئەسـتۆ بگرێـتو زامنـت بکـات، ئەویش ووتی: خوای گـەورە بەسـە بـۆ کـەفیل وزامنـی مـن، پیاوەکـە ووتـی: ڕاست دەکەیت، ئینجا پیاوەکە هەزار دیناری دایێـی بەقـەرز تـاکو ماوەیـەکی دیاریکراو، پاشان پیاوەکە ڕۆیشتو ئیشو کاری خۆی پێ جێبەجێ کرد، کـە ماوە دیاریکراوەکە تەواو بوو، پیاوە قەرزارەکە دەیویست سوارییەکی دەست بکـەوێتو پـارە قەرزەکـە بێنێتـەوە بـۆ خاوەنەکـەی، بـەڵام هیـچی دەسـت نەکەوت کە بچێتەوە بۆلای خـاوەن قەرزەکـە، بۆیـە دارێکـی هێنـاو دارەکـەی کون کرد ئینجا هەزار دینارەکەی کردە نـاو کـونی دارەکـەوەو نوسراوێکیـشی لەگەڵدا نارد بۆخاوەن قەرزەکە، پاشان دارەکەی جوان پێچایەوەو کردیە نـاو ئاوەکەوە، ئینجا هات بۆلای دەریاکەو ووتی: خوایە تۆ بۆ خۆت دەزانیـت مـن هەزار دینارم لە فلانەکەس وەرگـرت بـە قـەرز، داوای کـەفیلو زامنـی لێکـردم منیش ووتم: خوای گەورە بەسە بۆ کەفیلو زامنـی مـن، وە ڕازی بـوو بـەوەی تۆ کەفیل وزامنی مـن بکـەیت، هـەروەها داوای شـایەتی لێکـردم منـیش ووتم: خوای گەورە بەسە کە شایەتی من بێت، وە ڕازی بوو بـەوەی کـە تـۆ شـایەتم

بیت، وە من هەوڵ و کۆششم دا بۆئەوەی کە سوارییەکم دەست بکەوێت و پارەکەی بۆ ببەمەوە، بەڵام دەستم نەکەوت، ئەوا منیش بەتۆی دەسپێرم، ئینجا پیاوەکە دارەکەی کردە ناو دەریاکەوە، پاشان پیاوەکە ڕۆیشت، ئەو پیاوەی کە هەزار دینارەکەی دابوو بەقەرز سەیر سوارییەکانی دەکرد بەڵکو پیاوە قەرزارەکە بێت و قەرزەکەی بۆ بێنێتەوە، کاتێك سەیری ئاوەکەی دەکرد بینی کە دارێك لەسەر ئاوەکەیە، ئینجا پیاوەکە دارەکەی بردەوە بۆماڵەوەو مشارێکی بردو دارەکەی بڕییەوەو کاتێك سەیری کرد قەرزەکەو نوسراوێکی تێدایە، پاشان ماوەیەك پیاوە قەرزارەکە هات بۆ لای خاوەن قەرزەکەو هەزار دیناری تریشی لەگەڵ خۆیدا هێناو بە خاوەن قەرزەکەی ووت: سوێند بەخوا سواریم دەست نەکەوت تاکو قەرزەکەت بۆ بێنمەوە، بەردەوام هەوڵم دەدا بۆ ئەوەی کە سوارییەکم دەست بکەوێت و قەرزەکەت بۆ بێنمەوە، بەڵام هیچم دەست نەکەوت، خاوەن قەرزەکە ووتی: ئایا تۆ هیچ شتێکت بۆ من نەناردووە؟ ئەویش ووتی: پێتم ووت کە هیچ سوارییەکم دەست نەکەوت کە قەرزەکەت بۆ بێنمەوە، ئێستاش ئەوەتە هەزار دینارەکەم بۆ هێناوی، خاوەن قەرزەکە ووتی: بەڕاستی خوای گەورە ئەمانەتەکەی پێگەیاندمەوە، بەوەی کە قەرزەکەت کردبووە ناو دارێکەوە، ئەو هەزار دینارەی کە هێناوتە بۆ خۆت هەڵبگرەوە .

**چەند سوودو ئامۆژگارییەك لەم چیرۆکەدا.**

(١) بوونی پیاو چاکان و لەخواترس لە ناو ئوممەتەکانی پێش ئیسلام، ئەو پیاوەی قەرزەکەی دا بە پیاوەکەی تر بەمەبەستی پاداشتی پەروەردگار ئەو کارەی دەکرد، بۆیە بەوە ڕازی دەبوو کە خوا شایەت و کەفیل بێت .

(٢) قەرزدان بەخەڵکی لەشەرعدا ڕێگە پێدراوەو پاداشتی زۆری لەسەرە .

(٢) پێویستە لەکاتی قەرزداندا نوسراو هەبێت، وە کاتی دانەوەی دیاریکراو بێت، هەروەها شایەتیش هەبێت .

(٣) پێویستە موسڵمان هۆکار بگرێتە بەر پاشان پشت بەخوا ببەستێت .

(٤) هەر شتێك بە پەروەردگار بسپێردرێت، ئەوا دەی پارێزێت، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ( إِذَا اسْتُودِعَ اللَّهُ شَيْئًا حفِظَهُ )[1] .

**واتە:** ئەگەر شتێك بە خوای پەروەردگار بسپێردرێت، ئەوا دەی پارێزێت .

(٥) ئەگەر موسڵمان نیەتی پاك بێت و نیەتی دانەوەی قەرزی هەبێت، ئەوا خوای پەروەردگار کار ئاسانی بۆ دەکات، تاکو قەرزەکەی بداتەوە .

(٦) دانەوەی ئەمانەت و وەفا بەرامبەر بە خاوەن ئەمانەت واجبە، وە دروست نییە قەرز لەکاتی دیاریکراودا دوابخرێت، چونکە هەرکەسێك لە دونیادا قەرزەکەی نەداتەوە، ئەوا لە ڕۆژی دواییدا لەچاکەکانی قەرزی پێدەدرێتەوە.

(١) (صَحِيح) صَحَّحَهُ الشَّيْخ الأَلْبَانِي فِي صَحِيح الْجَامِع (١٧٠٨)، وَفِي السلسلة الصَّحِيحَة (٢٥٤٧) .

## القِصَّة العَاشِرَة: السَّحَابة التي أمِرَتْ أنْ تسقِي حَدِيقَة الرَّجُل الصَّالِحُ

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: ( بَيْنَا رَجُلٌ بِفَـلَاةٍ مِـنَ الأَرْضِ، فَسَمِعَ صَوْتًا فِي سَحَابَةٍ: اسْقِ حَدِيقَةَ فُلَانٍ، فَتَنَحَّى ذَلِكَ السَّحَابُ، فَأَفْرَغَ مَاءَهُ فِي حَرَّةٍ، فَإِذَا شَرْجَةٌ مِنْ تِلْكَ الشِّرَاجِ قَدِ اسْتَوْعَبَتْ ذَلِكَ الْمَاءَ كُلَّـهُ، فَتَتَبَّـعَ الْمَاءَ، فَإِذَا رَجُلٌ قَائِمٌ فِي حَدِيقَتِهِ يُحَوِّلُ الْمَاءَ بِمِسْحَاتِهِ، فَقَالَ لَهُ، يَا عَبْدَ اللَّـهِ، مَا اسْمُكَ؟ قَالَ فُلَانٌ لِلاسْمِ الَّذِي سَمِعَ فِي السَّحَابَةِ، فَقَالَ لَهُ: يَاعَبْدَ اللَّهِ لِـمَ تَسْأَلُنِي عَنِ اسْمِي؟ فَقَالَ: إِنِّي سَمِعْتُ صَوْتًافِي السَّحَابِ الَّذِي هَذَا مَاؤُهُ يَقُولُ: اسْقِ حَدِيقَةَ فُلَانٍ لِاسْمِكَ، فَمَا تَصْنَعُ فِيهَا؟ قَالَ: أَمَّا إِذَا قُلْتَ هَذَا فَإِنِّي أَنْظُـرُ إِلَى مَا يَخْرُجُ مِنْهَا، فَأَتَصَدَّقُ بِثُلُثِهِ، وَآكُلُ أَنَا وَعِيَالِي ثُلُثًا، وَأَرُدُّ فِيهَا ثُلُثَهُ )[1] .

## چیرۆکی دەیەم: ئەو هەورەی فەرمانی پێکرا باخی پیاوێك ئاوبدات

هـاوەڵی خۆشەویـست ئـەبو هـورەیرە (خـوای لێ ڕازی بێـت) دەفـەرمووێت: پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) فەرموویـەتی: لەکاتێکـدا پیاوێـك لەدەشـتێکدا بـوو، گوێی لە دەنگێك بوو بـە هـەورێکی دەووت: بـاخ و بێـستانی فلآنـە کـەس ئـاو بدە، ئینجا هەورەکـە ئاوەکـەی کـرد بەسـەر زەوییـەکی بـەردەڵانی ڕەشـدا ( زەویەکـە پڕبـوو لەبـەرد )، سـەیری کـرد ئاوەکـە هـەمووی بـە جۆگەلەیەکـدا ڕۆیشت، وە پیاوێك بەپێوە وەستابوو لەناو باخ وبێستانەکەیدا بەبێڵەکەیـەوە ئاودێری دەکات، ئەمیش بە پیاوە باخەوانەکەی ووت: ئەی بەندەی خوا ناوت چییە؟

---

(١) أخرَجَهُ مُسْلِمٌ (٧٣٩٨) .

پیاوە باخەوانەکە ووتی: فلان، ناوی خۆی پێ ووت، هەر ئەو ناوە بوو کە گوێی لێ بوو لە هەورەکە بیستی، پیاوە باخەوانەکە پێی ووت: ئەی بەندەی خوا بۆ لەناوی من دەپرسی؟

ئەمیش ووتی: چونکە گوێم لە دەنگێك بوو لە هەورەوە دەیووت: ئەمە ئاوەکەیەتی باخو بێستانی فلانەکەس ئاو بدە، ناوی تۆی هێنا !

پیاوە کە بە باخەوانەکەی ووت: ئایا تۆ چی لە بەروبوم وحاصلاتی ئەم باخو بێستانە دەکەیت؟ پیاوە باخەوانەکە ووتی: من چاوەڕێی بەروبومو حاصلاتی ئەم باخو بێستانە دەکەم، ئینجا هەرکات پێگەیشت، ئەوا سێ یەکی لێ دەکەم بەخێرو صەدەقە بۆ فەقیرو هەژاران، وە سێ یەکی لەگەڵ ماڵو منداڵەکەمدا دەیخۆین، هەروەها سێ یەکی بۆ بنەتۆو دەهێڵمەوە .

**چەند سوودو ئامۆژگارییەك لەم چیرۆکەدا.**

(١) پەروەردگار چەند مەلائیکەیەکی تایبەت کردووە بە هەورو باران بۆ ئاودانی باخو بێستانی ئەوکەسانەی خێرو صەدەقە دەدەن بە هەژاران .

(٢) موسڵمانی ژیرو داناو تێگەیشتو ئەو کەسەیە کە یارمەتی هەژارو لێقەوماوان بدات، وە مافی خێزانیشی بدات .

(٣) یارمەتیدانی هەژارانو لێقەوماوان هۆکارە بۆ زیاد بوونی ڕزقو ڕۆزیو فەرداری .

(٤) ئەگەر ناوی کەسێکت نەزانی پێی بڵێ بەندەی خوا .

(٥) ئەگەر کەسێك هەواڵی ناوەکەتی پرسی دروستە پێی بڵێی بۆ لە ناوی من دەپرسی وەکو خاوەن باخەکە بەپیاوەکەی ووت: بۆ لە ناوی من دەپرسی؟

(٦) دروستە گێڕانەوەی هەواڵی کەسێك کە خوای پەروەردگار ڕێزی لێنابێت، ئەگەر زانرا ئەو کەسە توشی فتنە نابێت .

(٧) دروستە گێڕانەوەی هەواڵی ئەو قەومانەی پێش خۆمان، بۆ ئەوەی ببێتە پەندو ئامۆژگاری بۆ ئێمە، چونکە بەڕاستی لە چیرۆكو بەسەرهاتەکانیاندا پەندو ئامۆژگاری هەیە بۆ کەسانێ کە ژیرو هۆشمەندن.

(٨) خوای پەروەردگار بەندەیەکی خۆش دەوێت کە کارەکانی بە جوانیو ڕێکو پێکی بەڕێوە ببات‌و مافی خۆی پێبدات، لەوانە: ئەو بەش کردنەی باخەوانەکە بوو کە بەرو بوومی باخەکەی دەکرد بەسێ بەشی یەکسانەوە .

(٩) هەر بەندەیەك خوای پەروەردگار لێی ڕازی بێت، ئەوا چی لە ئاسمان‌و زەویدا هەیە بۆی دەخاتە بەر دەستی، ئەو باخەوانە بەهۆی ئەوەی خوای پەروەردگار لێی ڕازی بوو بەویستی پەروەردگار ئەو هەورە باخەکەی ئاودا .

(١٠) یەکێك لە دەرگاکانی بەهەشت ناوی خێرو صەدەقەیە .

(١١) مەلائیکەتەکان دوای لێخۆش بوون بۆ ئەو کەسانە دەکەن کە لە پێناو ڕەزامەندی پەروەردگار دەبەخشن .

(١٢) هەر کەسێك لە پێناوی خوای پەروەردگاردا ببەخشێت، ئەوا خوای پەروەردگار جێگەی بەخشینەکەی بەزیادەوە بۆ پڕدەکاتەوە .

(١٣) بەخشین لەبەر ڕەزامەندی خوای گەورە پارێزەرە لە ئاگر .

(١٤) بەخشین لەبەر ڕەزامەندی خوای پەروەردگار چارەسەرە بۆ نەخۆشی .

(١٥) بەخشین لەبەر ڕەزامەندی خوای گەورە توڕەیی خوا لادەبات .

## القصَّة الحَادِيَة عَشر: جُرَيْج العَابِد

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) قَالَ: قَالَ: رَسُولُ اللَّه (ﷺ) كَانَ رَجُلٌ فِي بَنِي إِسْرَائِيلَ، يُقَالُ لَهُ جُرَيْجٌ، وَكَانَ جُرَيْجٌ رَجُلاً عَابِدًا فَاتَّخَذَ صَوْمَعَةً فَكَانَ فِيهَا فَأَتَتْهُ أُمُّهُ وَهُوَ يُصَلِّي فَقَالَتْ يَا جُرَيْجُ، فَقَالَ: يَا رَبِّ أُمِّي وَصَلاَتِي، فَأَقْبَلَ عَلَى صَلاَتِهِ فَانْصَرَفَتْ، فَلَمَّا كَانَ مِنَ الْغَدِ أَتَتْهُ وَهُوَ يُصَلِّي فَقَالَتْ: يَا جُرَيْجُ فَقَالَ يَا رَبِّ أُمِّي وَصَلاَتِي فَأَقْبَلَ عَلَى صَلاَتِهِ فَانْصَرَفَتْ فَلَمَّا كَانَ مِنَ الْغَدِ أَتَتْهُ وَهُوَ يُصَلِّي فَقَالَتْ: يَا جُرَيْجُ، فَقَالَ: أَيْ رَبِّ أُمِّي وَصَلاَتِي، فَأَقْبَلَ عَلَى صَلاَتِهِ فَقَالَتِ اللَّهُمَّ لاَ تُمِتْهُ حَتَّى يَنْظُرَ إِلَى وُجُوهِ الْمُومِسَاتِ، فَتَذَاكَرَ بَنُو إِسْرَائِيلَ جُرَيْجًا وَعِبَادَتَهُ وَكَانَتِ امْرَأَةٌ بَغِيٌّ يُتَمَثَّلُ بِحُسْنِهَا فَقَالَتْ إِنْ شِئْتُمْ لأَفْتِنَنَّهُ لَكُمْ قَالَ: فَتَعَرَّضَتْ لَهُ فَلَمْ يَلْتَفِتْ إِلَيْهَا فَأَتَتْ رَاعِيًا كَانَ يَأْوِي إِلَى صَوْمَعَتِهِ فَأَمْكَنَتْهُ مِنْ نَفْسِهَا فَوَقَعَ عَلَيْهَا فَحَمَلَتْ فَلَمَّا وَلَدَتْ قَالَتْ هُوَ مِنْ جُرَيْجٍ، فَأَتَوْهُ فَاسْتَنْزَلُوهُ وَهَدَمُوا صَوْمَعَتَهُ وَجَعَلُوا يَضْرِبُونَهُ فَقَالَ مَا شَأْنُكُمْ؟ قَالُوا زَنَيْتَ بِهَذِهِ الْبَغِيِّ فَوَلَدَتْ مِنْكَ فَقَالَ: أَيْنَ الصَّبِيُّ؟ فَجَاءُوا بِهِ فَقَالَ: دَعُونِي حَتَّى أُصَلِّيَ فَصَلَّى فَلَمَّا انْصَرَفَ أَتَى الصَّبِيَّ فَطَعَنَ فِي بَطْنِهِ وَقَالَ يَا غُلاَمُ مَنْ أَبُوكَ قَالَ فُلاَنٌ الرَّاعِي قَالَ: فَأَقْبَلُوا عَلَى جُرَيْجٍ يُقَبِّلُونَهُ وَيَتَمَسَّحُونَ بِهِ وَقَالُوا نَبْنِي لَكَ صَوْمَعَتَكَ مِنْ ذَهَبٍ قَالَ: لاَ أَعِيدُوهَا مِنْ طِينٍ كَمَا كَانَتْ فَفَعَلُوا ) [1] .

---

(١) أَخرَجَهُ الْبُخَارِيُّ (٢٤٨٢)، وَمُسْلِمٌ (٦٤٥٥) .

## چیرۆکی پانزەیەم: جورەیجی خوا پەرست

هاوەڵی خۆشەویست ئەبو هورەیرە (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمووێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: پیاوێك هەبوو لە ئوممەتانی پێش ئێوە (لە بەنی ئیسرائیل)، پێی دەووترا جورەیج، جورەیج پیاوێكی خواپەرست بوو، شوێنێكی بۆ خۆی دابین كردبوو (لەو شوێنەدا بەندایەتی تێدا دەكرد بۆ خوا) جارێكیان جورەیج نوێژی دەكرد (نوێژی سوننەت) دایكی هات بۆلای‌و پێی ووت: كوڕم جورەیج، جورەیج لەدڵی خۆیدا ووتی: پەروەردگار دایكم یان نوێژەكەم، ئینجا نوێژەكەی هەڵبژارد (واتە: بەردەوام بوو لەسەر نوێژەكەی)، دایكی ڕۆیشت، بۆ بەیانی بەهەمان شێوە دایكی هاتەوەو جورەیج نوێژی دەكرد، پێی ووت: كوڕم جورەیج، ئەویش ووتی: پەروەردگار دایكم یان نوێژەكەم، ئینجا نوێژەكەی هەڵبژارد (بەردەوام بوو لەسەر نوێژەكەی)، دایكی ڕۆیشت، بۆ بەیانی بەهەمان شێوە دایكی هاتەوەو جورەیج نوێژی دەكرد، پێی ووت: كوڕم جورەیج، ئەویش ووتی: پەروەردگار دایكم یان نوێژەكەم، ئینجا نوێژەكەی هەڵبژارد (بەردەوام بوو لەسەر نوێژەكەی)، ئینجا دایكی ووتی: خوایە مەیمرێنە تاكو ڕوخساری داوێن پیسان دەبینێت، بەنی ئیسرائیلیەكان كەوتنە باسكردنی جورەیج‌و بەندایەتیەكەی، وە ئافرەتێك بەد ڕەوشت (داوێن پیس) هەبوو كە نموونە بوو لە جوانیدا، ئافرەتەكە ووتی: ئەگەر ئێوە بتانەوێ ئەوا من جورەیج لەخشتە دەبەم‌و توشی فیتنەی دەكەم، ئینجا ئافرەتەكە چوو بۆلای جورەیج‌و (ڕێگەی پێگرت بەوەی كاری داوێن پیسی لەگەڵدا بكات)، بەڵام جورەیج گوێی پێ

نەدا، ئافرەتەکەش چوو بۆلای شوانێك کە ئەو شوانە سەردانی جورەیجی دەکرد، ئافرەتەکە لەگەڵ شوانەکەدا کاری داوێن پیسی کردو سکی پڕبوو (واتە: حامیلە بوو لەو شوانە)، کاتێك کەمنداڵەکەی بوو، ئافرەتە داوێن پیسەکە ووتی: ئەم منداڵە لە جورەیجە، ئینجا خەڵکەکە چوون بۆ لای جورەیجو ئەو شوێنەی کە جورەیج بەندایەتی تێدا دەکرد ڕووخانیان وتێکیاندا، وە دەستیان کرد بەلێدانی جورەیج، جورەیجی خواپەرست ووتی: چیتانە بۆچی وام لێدەکەنو لێم دەدەن؟ خەڵکەکەش ووتیان: تۆ لەگەڵ ئەم ئافرەتە کاری داوێن پیسیت کردووەو منداڵت لێی بووە، جورەیج ووتی: کوا منداڵەکە؟ خەڵکەکەش منداڵەکەیان بۆهێنا، جورەیج ووتی: وازم لێ بێنن با نوێژ بکەم، پاشان نوێژی کردو کاتێك لێ بووەوە، هات بۆلای منداڵەکەو دەستی هێنا بەسکی منداڵەکەداو ووتی: کوڕە باوکت کێیە؟ منداڵەکەش هاتە زمانو ووتی: فلانە کەسی شوان، ئینجا خەڵکەکە ڕوویان کردە جورەیجو ماچیان دەکردو دەستیان پێدا دەهێناو پاشان خەڵکەکە بە جورەیجیان ووت: شوێنێك (جێگەیەکت) بۆ دروست دەکەینەوە لە ئاڵتون وزیو؟ جورەیج ووتی: نەخێر، بەڵکو وەکو خۆیم بۆ لێبکەنەوە کە لەگڵ دروست کرابوو، خەڵکەکەش شوێنەکەیان بۆ دروستکردەوە.

**چەند سوودو ئامۆژگارییەك لەم چیرۆکەدا.**

(١) ئازاردانی دایكو باوكو پشتگوێ خستنیان هۆکارە بۆ تووش بوون بە فیتنەو ناخۆشی ژیان، وەك ئەوەی لەم چیرۆکەدا ڕوویدا .

(٢) نابێت دایكو باوك دوعاو نزا لە منداڵەکانیان بکەن، چونکە دوعاو پاڕانەوەیان قەبوڵەو پێغەمبەری خوا (ﷺ) قەدەغەی لەو کارە کردووە .

(٣) وەڵامدانەوەی دایك لە پێشترە لە نوێژی سوننەت، چونکە وەڵامدانەوەی دایك پێویست (واجب)ە، وە واجبو پێویست پێش سوننەت دەخرێت، جا ئەگەر یەکێك لە نوێژی سوننەتدا بوو دایکی یان باوکی بانگیان کرد، ئەوا دەبێت نوێژەکەی ببڕێتو وەڵامیان بداتەوە ئەگەر زانیتی تورە دەبن، بەڵام ئەگەر زانیتی کە تورە نابن ئەوا با نوێژەکەی نەبڕێت، بەڵکو کورتی بکاتەوەو پاشان وەڵامیان بداتەوە، هەروەها ئەگەر نوێژەکە فەرز بوو ئەوا با نوێژەکەی نەبڕێت، بەڵکو کورتی بکاتەوە .

(٤) هەرکەسێك ڕاست بکات لەگەڵ خوادا، هیچ فیتنەیەك زیانی پێناگەیەنێت.

(٥) بەهێزی باوەڕی جورەیج ئەوەبوو منداڵێکی تازە لەدایك بوو دێتە قسە.

(٦) هەرکەسێك لەکاتی خۆشیدا خوا بناسێتو بەندایەتی بۆبکات، ئەوا خوای گەورە لەکاتی تەنگانەدا بەتەنگیەوە دێتو ڕزگاری دەکات .

(٧) هەرکەسێك کاری داوێن پیسیو بەد ڕەوشتی بکات، ئەوا سومعەو ڕێزو سەنگی نامێنێت لەناو خەڵکیدا .

(٨) تاقیکردنەوەی پەروەردگار بۆ بەندە صالحەکان، بۆ ئەوەی دەربکەوێت تاچەندە ئارامگرن بەرامبەر بە ناڕەحەتی دونیا، وە جورەیج تاقیکرایەوە بەوەی کە ماڵەکەیان ڕووخاندو لێیانداو قسەی ناشیرینیان پێی ووت .

(١٠) نوێژ تەنها تایبەت نەبووە بەم ئوممەتەوە، بەڵکو ئوممەتانی تریش نوێژیان لەسەر بووە، بەڵام جیاوازی هەبووە لەگەڵ نوێژی ئەم ئوممەتەدا .

(١١) مرۆڤی باوەڕدار لەکاتی ناخۆشیو ئازارو پەژارەدا پەنا دەبات بۆ نوێژ، خوای پەروەردگار فەرموویەتی:﴿ وَٱسۡتَعِينُواْ بِٱلصَّبۡرِ وَٱلصَّلَوٰةِۚ ﴿٤٥﴾ ﴾ سورة البقرة **واتە:** پشت ببەستن بەنوێژو ئارامگرتن (بۆگەیشتن بە ئامانج)، وە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەگەر کارێکی ناخۆشو ناڕەحەت بهاتایەتە پێش ئەوا نوێژی دەکرد ( إِذَا حَزَبَهُ أَمْرٌ صَلَّى )[1] .

(١٢) دروستە بیرکردنەوە لەناو نوێژدا، جورەیجی خواپەرست بیری دەکردەوەو دەی ووت: پەروەردگار دایکم یان نوێژەکەم، ئینجا نوێژەکەی هەڵدە بژاردو بەردەوام دەبوو لەسەر نوێژەکەی .

(١٣) لە دوای هەموو ناڕەحەتییەك خۆشیو ئاسودەیی بەدوادا دێت .

(١٤) فێڵو نەخشەو پیلانی ئافرەتی داوێن پیس زۆر گەورەو مەترسی دارە .

(١٥) خۆ بەکەم زانینو دونیانەویستی جورەیج بەوەی خەڵکەکە پێیان ووت: شوێنو جێگەیەکت بۆ دروست دەکەینەوە لە ئاڵتونو زیو؟ بەڵام جورەیج ووتی: نەخێر، بەڵکو وەکو خۆیم بۆ لێ بکەنەوە کە لەگڵ دروست کرابوو .

(١٦) نابێت هەرکەسێك هەواڵێکی گێڕایەوە یان تۆمەتێکی دایە پاڵ کەسێك، یەکسەر باوەڕی پێ بکرێت بەبێ ئەوەی بەڵگە یان سەلماندنێکی هەبێت، هەروەك خەڵکی ئەو گوندە ئەنجامیانداو باوەڕیان بەقسەی ئەو ئافرەتە داوێن پیسەکرد، پێویست بوو لەسەر ئەو خەڵکە لەقسەی ئەو ئافرەتە بکۆڵنەوە پێش ئەوەی لە جورەیج بدەنوماڵەکەی تێك بدەن .

---

(١) (حَسَن) أَخْرَجَهُ أَبُودَاوُد، وَحَسَّنَهُ الشَّيْخ الأَلْبَانِيّ فِي صَحِيح الْجَامِع (٤٧٠٣) .

## القِصَّة الثَّانِية عَشر: رَجُل دَخَلَ الجَنَّة بِتَنحِيَته الأَذَى عَنْ طَرِيق

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) أَنَّ رَسُولَ اللَّـه (ﷺ) قَـالَ: بَيْنَمَـا رَجُـلٌ يَمْـشِي بِطَرِيقٍ، وَجَدَ غُصْنَ شَوْكٍ فَأَخَذَهُ فَشَكَرَ اللَّهُ لَهُ، فَغَفَرَ لَهُ )[1] .

وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: لَقَـدْ رَأَيْـتُ رَجُـلاً يَتَقَلَّـبُ فِي الْجَنَّةِ فِي شَجَرَةٍ قَطَعَهَا مِنْ ظَهْرِ الطَّرِيقِ كَانَتْ تُؤْذِي النَّاس )[2].

**چیرۆکی دوانزەیەم: پیاوێك چووە بەهەشتەوە بەهۆی لابردنی ناڕەحەتی لەسەر ڕێگە**

هـاوەڵی خۆشەویـست ئـەبو هـورەیرە (خـوای لێ ڕازی بێـت) دەفـەرمووێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: لە کاتێکدا پیاوێك بەڕێگـەدا دەڕۆیـشت، لقە دارێکی دڕکاوی دەبینێت ولای دەبات لەسـەر ڕێگاکـەو دوری دەخاتـەوە، خوای گەورە ئەو کارەی لێ وەرگرتو سوپاسـی کـردو لێـی خۆشبوو، وە لـە ڕیوایەتێکی تردا : ئەبو هورەیرە (خوای لێ ڕازی بێت) دەفـەرمووێت: پێغەمبـەری خوا (ﷺ) فەرموویـەتی: پیـاوێکم بینـی لـە خۆشـیو نـازو نیعمـەتا بـوو لـە بەهەشتدا، چونکە دارێکی لەسەر ڕێگە بڕی بوو، ئەو دارە خەڵکی ئازار دەدا.

**چەند سوودو ئامۆژگارییەك لەم چیرۆکەدا.**

(١) بەخـشندەییو میهرەبـانی خـوای پـەروەردگار بەرامبـەر بەنـدەکانی، لـە بەندەیەکی خۆش دەبێت بەهۆی ئەوەی دارێکی لەسەر ڕێگە بڕیووە .

(٢) ڕێگەو بان مافی هەیە، یـەکێك لەمافـەکانی ئەوەیـە کاتێك ناڕەحەتییـەك لەسەر ڕێگە دەبینیت، وەك (دڕكو دارو بەردو ئاسنو هتد) لای ببەی .

---

(١) أخرجَهُ البُخاريُّ (٢٤٧٢)، ومُسْلِمٌ (٦٦١٢) .

(٢) أخرجَه مُسْلِمٌ (٦٦١٤) .

(٣) فەزڵو پاداشتی لابردنی نارەحەتیو ئازار پێگەیاندن لەسەر ڕێگەوبان، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: هەر کەسێك بەردێك نارەحەتیەك لەسەر ڕێگەی خەڵکی لابدات، ئەوا چاکەیەکی بۆ دەنوسرێت، وە هەرکەسێکیش چاکەی هەبێت دەچێتە بەهەشتەوە[1] .

(٤) کردەوەی چاك هەرچەندە کەم بێت پاداشتی زۆری لەسەر، ئەبو بەرزەی ئەسلەمی (ڕەزای خوای لێبێت) فەرمووی ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) شتێکم فێربکە سودی لێ وەربگرم؟ فەرمووی: ( اعْزِلِ الأَذَى عَنْ طَرِيقِ الْمُسْلِمِينَ )[2].

**واتە:** نارەحەتی وئازار پێگەیاندنی سەر ڕێگەو بانی موسڵمانان لابدە .

(٥) زۆرێك لە خەڵکی توشی هەڵەو تاوانو سەرپێچی دەبن، بەوەی کە خۆڵو خاشاکو شتی پیس فڕێ دەدات لەسەر ڕێگەی موسڵمانان .

(٦) ئەو دارو درختانە دروستە ببڕدرێت کە مایەی ئازارو نارەحەتی خەڵکییە، بەڵام ئەگەر سودی هەبوو بۆ خەڵکی بەوەی لە سێبەری دابنیشن یان لە بەرو بومی بخۆن، ئەوا دروست نییە ببڕدرێت، بەڵکو پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەڕەشەی توندی لەو کەسانە کردووە کە دارو درختێك دەبڕن سودی هەیە بۆ موسڵمانان، دەفەرمووێت: ( مَنْ قَطَعَ سِدْرَةً صَوَّبَ اللَّهُ رَأْسَهُ فِي النَّارِ )[3].

**واتە:** هەرکەسێك داری توترك ببڕێت ( دارێکی دڕکاوییە بۆ پەرژین بەکاردێت )، ئەوا خوای گەورە سەری بە ئاگر دادەپۆشێت .

---

(١) (حَسَن) أخرَجَهُ الطَّبرَانِيُّ فِي الْمُعْجَم الْكَبِير، وَحَسَّنَهُ الشَّيْخ الألْبَانِي فِي صَحِيح الْجَامِع (٦٢٦٥) .

(٢) أخرَجَه مُسْلِمٌ (٦٦١٦) .

(٣) (صَحِيح) أخرَجَهُ أَبُودَاوُد، وصَحَّحَهُ الشَّيْخ الألْبَانِي فِي صَحِيح الْجَامِع (٦٤٧٦) وَفِي الصَحِيحَة (٦١٤) .

## القِصَّة الثَّالِثَة عَشر: النَّبِيّ الَّذِي أحرَقَ قَرْيَة النَّمْل

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ: ( نَزَلَ نَبِيٌّ مِنَ الأَنْبِيَاءِ تَحْتَ شَجَرَةٍ، فَلَدَغَتْهُ نَمْلَةٌ، فَأَمَرَ بِجِهَازِهِ فَأُخْرِجَ مِنْ تَحْتِهَا ثُمَّ أَمَرَ بِهَا فَأُحْرِقَتْ فَأَوْحَى اللَّـهُ إِلَيْهِ، فَهَلاَّ نَمْلَةً وَاحِدَةً )[1] .

وَفِي رِوَايَةٍ: ( أَنَّ نَمْلَةً قَرَصَتْ نَبِيًّا مِنَ الأَنْبِيَاءِ فَأَمَرَ بِقَرْيَةِ النَّمْلِ فَأُحْرِقَتْ فَأَوْحَى اللَّهُ إِلَيْهِ أَفِي أَنْ قَرَصَتْكَ نَمْلَةٌ أَهْلَكْتَ أُمَّةً مِنَ الأُمَمِ تُسَبِّحُ )[2] .

## چیرۆکی سیانزەیەم : ئەو پێغەمبەرەی شارە مێرولەیەکی سوتاند

هاوەڵی خۆشەویست ئەبو هورەیرە (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: پێغەمبەرێك لە پێغەمبەران هەواری خست لەبن دارێکدا، مێرولەیەك گازی لێگرت، ئینجا پێغەمبەرەکە فەرمانی کرد جێگەو خواردنەکەیان هەڵ بگرن لەبن ئەو دارەدا، پاشان فەرمانی کرد شارە مێرولەکەیان سوتان، پەروەردگار وەحی بۆنارد، ئەی بۆچی تەنها یەك مێرولەت نە سوتان (ئەو مێرولەیەی کە گازی لێگرتی .

وە لە ڕیوایەتێکی تردا مێرولەیەك گازی لە پێغەمبەرێك لە پێغەمبەرەکان گرت، ئینجا پێغەمبەرەکە فەرمانی کرد کە شارە مێرولەکە بسوتێنن، وە خوای پەروەردگار سروشی بۆنارد، ئایا مێرولەیەك گازی لێگرتی، بەڵام تۆ ئوممەتێك (گەلێك)کت لە ناو برد کە تەسبیحاتو ستایشی خوایان دەکرد .

---

(١) أخرجهُ البُخاريُّ (٥٧٩٨) ومُسْلِمٌ (٥٨١١) .

(٢) أخرجهُ البُخاريُّ (٣٣١٩) ومُسْلِمٌ (٥٨١٠) .

## چەند سوودو ئامۆژگارییەك لەم چیرۆكەدا.

(١) ئاگادار کردنەوە لە تورِە بوون .

(٢) پێویستە مرۆڤ دادپەروەر بێت، چونکە هیچ کەسێکی گوناهبار گوناهی هیچ کەسێکی تر هەڵ ناگرێت .

(٣) لە ئوممەتانی پێشودا دروست بووە مێرولە بسوتێنرێت، بەڵام لەشەرعی ئەم ئوممەتەدا دروست نییەو قەدەغەکراوە سزای مارو مێرو بدرێت بەئاگر، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (إِنَّهُ لاَ يَنْبَغِي أَنْ يُعَذِّبَ بِالنَّارِ إِلاَّ رَبُّ النَّارِ)[1]
**واتە:** هیچ کەس بۆی نییە سزای خەڵکی بدات بە ئاگر جگە لە خوای گەورە.

(٤) کوشتنی مێرولە قەدەغەکراوە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ( نَهَى عَنْ قَتْلِ أَرْبَعٍ مِنَ الدَّوَابِّ النَّمْلَةُ وَالنَّحْلَةُ وَالْهُدْهُدُ وَالصُّرَدُ )[2] .
**واتە:** قەدەغە کراوە لە کوشتنی چوار گیانەوەر ئەوانیش: مێرولەو هەنگو هودهودو صورد (صورد: باڵندەیەکە سەری گەورەیەو ژێرسکی سپیەو سەر پشتی سەوزەو پەلەوەری بچوك دەخوات) .

(٥) جاری وا هەیە بەهۆی کرداری هەندیك لەخەڵکی ئوممەتێك لە ناو دەچێت، وەك چۆن ئەو مێرولەیە بە ئەنجامدانی کارێکی هەڵە ئوممەتێکی بە سوتاندن دا .

---

(١) (صَحِيح) أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُد وَصَحَّحَهُ الشَّيْخ الأَلْبَانِي فِي صَحِيح الْجَامِع (٢٤٢٥) .

(٢) (صَحِيح) أَخْرَجَهُ أَبُودَاوُد وَابن مَاجَه وَصَحَّحَهُ الشَّيْخ الأَلْبَانِي فِي صَحِيح الْجَامِع(٦٩٦٨).

(٦) مێرولە تەسبیحاتو ستایشی خوای گەورە دەكات، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ تُسَبِّحُ لَهُ ٱلسَّمَٰوَٰتُ ٱلسَّبۡعُ وَٱلۡأَرۡضُ وَمَن فِيهِنَّۚ وَإِن مِّن شَيۡءٍ إِلَّا يُسَبِّحُ بِحَمۡدِهِۦ وَلَٰكِن لَّا تَفۡقَهُونَ تَسۡبِيحَهُمۡۚ إِنَّهُۥ كَانَ حَلِيمًا غَفُورٗا ﴿٤٤﴾ ﴾ الإسراء: ٤٤ .

واتە: ستایشی خوای گەورە دەكەن هەر حەوت ئاسمانەكان، هەروەها زەویی‌و ئەوەی لەناویدایە، وە هیچ شتێك نییە كە بە سوپاسی ئەو ستایش نەكات، بەڵام ئێوە تێ ناگەن لە تەسبیحاتەكانیان، بەڕاستی خوای گەورە زۆر هێدی‌و لێبووردەیە .

(٧) زانایان دەفەرموون: ئەگەر مێرولە لەماڵدا هەبوو، ئەوا ئەتوانیت گازی لێ نزیك بكەیتەوە بۆ ئەوەی ئاگادار ببێتەوەو بڕوا، وە بە ویستی خوا دەڕوات، وە ئەگەر هەر نەڕۆیشت وبێزاری دەكردی، ئەوا دەتوانیت بیكوژیت نەك بیسوتێنیت[1] .

(١) شَرْح رِيَاض الصَّالِحِينَ، لِلشَّيْخِ الْعَلاَّمَة: مُحَمَّد بن صَالِح الْعُثَيمين (رَحِمَهُ اللّه) .

## القِصَّة الرَّابِعَة عَشر: عَجُوز بَنِي إِسْرَائِيلَ

عنْ أَبِي مُوسَى الْأَشْعَرِيّ (رضي الله عنه) أَتَى النَّبِيّ (ﷺ) أَعْرَابِيًّا فَأَكْرَمَهُ فَقَالَ لهُ: ائْتنَا، فَأَتَاهُ: فَقَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ) سَلْ حَاجَتَك، فَقَالَ: نَاقَة برَحْلِهَا، وَأَعْنزاً يَحْلِبُهَا أَهْلي! فَقَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ) أَعَجَزْتُمْ أَنْ تَكُونُوا مِثْلَ عَجُوز بَنِي إِسْرَائِيل، فَقَالَ الصَّحَابَة: يَا رَسُول اللَّه وَ مَا عَجُوز بَنِي إِسْرَائِيل؟ قَالَ: إِنّ مُوسى (عَلَيْهِم الصَّلاةُ وَالسَّلام) لَمَّا سَارَ بِبَنِي إِسْرَائِيل مِنْ مصْر، ضَلُّوا الطَّرِيق، فَقَالَ: مَا هَذَا؟ فَقَالَ: عُلَمَاؤهُم: نَحْنُ نُحَدِّثُكَ، إِنّ يُوسُفَ (عَلَيْهِم الصَّلاةُ وَالسَّلام) لَمَّا حَضَرَهُ الْمَوْتن أَخَذَ عَلَيْنَا مَوْثِقاً مِنَ اللهِ أَنْ لاَ نَخْرُج مِنْ مصْرَ حَتَى نَنْقُلَ عظَامَهُ مَعَنَا، قَالَ: فَمَنْ يَعْلَمُ مَوْضِعَ قَبْرَه؟ قَالوا: مَا نَدْرِي أَيْنَ قَبْرُ يُوسُفَ (عَلَيْهِم الصَّلاةُ وَالسَّلام)، إلاَ عَجُوزٌ مَنْ بَنِي إِسْرَائيل، فَبَعَثَ إِلَيْهَا، فَأَتَتْه، فَقَالَ: دُلُّونِي عَلَى قَبْر يُوسُف (عَلَيْهِم الصَّلاةُ وَالسَّلام)، قَالَتْ: لا وَاللهِ لا أَفْعَل حَتَى تُعْطِينِي حُكْمِي، قَالَ: وَ مَا حُكْمُك؟ قَالَتْ: أَكُونُ مَعَك فِي الجَنَّة، فَكَرِهَ أَنْ يُعْطِيهَا ذَلك، فَأَوْحَى اللهُ إِلَيْه أَنْ أَعْطِهَا حُكْمَها، فَانْطَلَقَتْ بِهن إِلَى بُحَيْرة مَوْضِعَ مُسْتَنْقَعِ مَاءٍ، فَقَالَتْ: أَنْضِبُوا هَذَا المَاءَ فَأَنضبُوا، قَالَتْ: احْفُروا وَ اسْتَخْرِجوا عِظَام يُوسُف (عَلَيْهِم الصَّلاةُ وَالسَّلام) فَلَمَا أَقَلُّوهَا إِلَى الأَرْض، إِذَا الطريقُ مِثْلُ ضَوْءِ النَّهار[1].

---

(١) (صَحِيح) أَخْرَجَهُ أَبويَعْلى وَالْحاكم وَصَحَّحَهُ الشَّيخ الأَلْبَانِي فِي السِلسِلة الصَحِيحَة (٣١٣) .

## چیرۆکی چواردەیەم: پیرە ژنەکەی بەنی ئیسرائیل

هاوەڵی خۆشەویست ئەبو موسای ئەشعەری (خوای لێ ڕازی بێت) دەفـەرمووێت: پیاوێکی گوندنشین هـات بۆ لای پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) وە ڕێـزی لێگـرتو پاشان فەرمووی: وەرە بۆلامـان؟ پیاوەکـەش هـات بـۆلای، پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) فـەرمووی: داوابکـە چـیت پێویـستە؟ پیـاوە گوندنـشینەکە ووتـی: ووشـتریکم پێویـستە بـە بـارەوەو بـزنێکیش شـیری هـەبێت بۆمـاڵو منـداڵم، پێغەمبەری خـوا (ﷺ) فـەرمووی: سـەیرم لـێ دێـتو بەلامـەوە سـەیرە ئایا ناتوانن وەکو ئەو پیرەژنـەی بـەنی ئیسرائیل بکـەن، هاوەڵـەکان فـەرموویان: ئەی پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) ئـەو پیرەژنـەی بـەنی ئیسرائیل چیە؟ ئـەویش فـــەرمووی: کاتێـــك موســـا (عليه السلام) لەگـــەڵ ئوممەتەکـــەی دەرچـــوون وڕۆیشتنەدەر(شەو ڕەوی پێکردن) لەمیصر، ڕێگەکەیان لـێ تێك چوو لێیـان وون بوو، ووترا: ئەمەچیە؟ ئینجا زاناکانیـان ووتیـان: ئێمـە پێتـان دەڵـێین، لەکاتێکدا پێغەمبەر یوسف (عليه السلام) مردنی نزیك بوویەوە، پەیمانو وەعدی لـە بـاو باپیرانمـان وەرگـرت بـەهیچ شـێوەیەك لـە میـصر نەچـنەدەر تـاکو ئێسکانەکانی لاشەکەی پێغەمبـەر یوسـف (عليه السلام) لەگـەڵ خۆیـان نەبەنـەدەر، فـەرمووی: کـێ شـوێنی قەبرەکـەی دەزانێـت؟ ووتـرا: نـازانین قەبرەکـەی لـە کوێدایە، جگە لە پیرەژنێکی بەنی ئیسرائیلی، ئینجا پێغەمبـەر موسـا (عليه السلام) ناردی بەشوێن پیرەژنەکەدا ئەویش هـات، پێـی فـەرموو: پێمـان بڵـێ قـەبری پێغەمبەر یوسف (عليه السلام) لەکوێیە؟ پیرەژنەکـە ووتـی: نـا بـەخوا پێتـان نـاڵێم

تاکو ئەوەی دەمەوێت پێم نەدەن، ئەویش پێی فەرموو: حەقی تۆچییەو داوای چی دەکەیت؟ پیرەژنەکە ووتی: لەگەڵتابم لە بەهەشتدا!

پێغەمبەر موسا (عليه السلام) پێی ناخۆش بوو ئەو حەقەی پێ بدات، چونکە ئەو داواکاریە لە دەسەڵاتی ئەودا نییە، خوای گەورە وەحی بۆ پێغەمبەر موسا (عليه السلام) نارد کە حەقی خۆی پێ بدات، ئینجا پیرەژنەکە کەوتەڕێ بۆئەوەی شوێنی قەبرەکەیان پێ بڵێت، تاکو گەیشتە دەریاچەیەك گۆمێك ئاوی تێدا ڕاوەستابوو، پیرەژنەکە ووتی: ئێرە هەڵ بکەنو دەری بکەن، ئەوانیش هەڵیانکەندو ئێسکانەکانی لاشەکەی پێغەمبەر یوسف (عليه السلام) دەرکەوتوو هەڵیان گرتو لەسەر زەوی دایان ناو بەرزیان کردەوە، پاشان ڕێگەو بان وەك ڕۆژی لێهاتو ڕوناك بووەوە .

## چەند سوودو ئامۆژگارییەك لەم چیرۆکەدا.

(١) پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێی خۆش بووەو حەزی کردووە کە ئوممەتەکەی وەکو ئەو پیرەژنەی بەنی ئیسرائیل داوای پلەو پایەی بەرز بکەن .

(٢) ڕودانی موعجزەی پێغەمبەر یوسف (عليه السلام) بەوەی کە ئوممەتەکەی لەدوای خۆی ئێسکەکانی بەجێ دەهێڵن، بۆیە فەرمانی کرد بەوەی کە هەرکات میصریان بەجێهێشتو چوون بۆ شام، ئەوا ئێسکی پیرۆزی ئەمیش لەگەڵ خۆیان ببەن، بۆئەوەی لەگەڵ باوكو باپیرانیدا بنێژرێت .

(٣) ڕودانی موعجزەی پێغەمبەر یوسف (عليه السلام) لەدوای مردنی بەوەی کە ئوممەتەکەی بەجێیانهێشت ڕێگەیان لێ تێك چوو وە بەدەرکەوتنی لاشەو ئێسکانە پیرۆزەکانی ڕێگاکەیان بۆڕوون بۆوە .

(٤) لە ناو بەنی ئیسرائیلدا ئافرەتی چاكو لە خواترس هەبووە كە زۆر تامەزرۆی بەهەشتو هاوەڵی پێغەمبەران بووە .

(٥) پێویستە مرۆڤی باوەڕدار لەكاتی نزیك بوونەوەی مردنیدا وەسیەت بكات بۆ منداڵ وخێزانو كەس‌وكاری، بەوەی كە مافی كێی لایە یان كێ مافی لایەتیو...هتد.

(٦) پێویستە كەسو كاری مردوو وەسیەتی مردوو جێبەجێبكەن، ئەگەر وەسیەتەكە شەرعی بوو (واتە: تاوان وهەڵەو گوناهكاری وبیدعەوگێروگرفتی تێدانەبوو، وە ئەگەر وەسیەت (تاوانو هەڵەو گوناهكاریو بیدعە گێروگرفتی تێدا بوو) ئەوا پێویستە لەسەر كەسو كاری مردووەكە جێبەجێی نەكەن[1] .

(٧) تامەزرۆیی بەندە صاڵحەكان بۆ بەهەشتی خوای گەورەو نەویستنی دونیا، بەوەی كاتێك پیرەژنەكە ووتی: قەبرەكەتان پێ ناڵێم تاكو پەیمانم پێنەدەی بەوەی كە لە بەهەشتدا لەگەڵتابم! خوای گەورە وەحی بۆ پێغەمبەر موسا (عليه السلام) نارد كە پەیمانو حەقی پێ بدات .

(٨) كەم تەرخەمی بەنی ئیسرائیلو گوێ نەدانیان بە قەبری پێغەمبەران، لەسەر ئەوەی پێغەمبەر موسا (عليه السلام) لەناویاندا بووەو قەبری پێغەمبەر یوسف (عليه السلام) یان نەزانیووە .

---

(١) بۆزیاتر شارەزابوونت بڕوانە پەرتوكی (أَحْكام الجَنَائِز وَبِدَعُهَا) للشيخ: مُحَمَّد نَاصِر الدِّين الأَلْبَانِي (رحمه الله).

## القِصَّة الخَامِسَة عَشر: المَرْأة الّتي صَنَعَتْ رِجْلَيْنِ مِنْ خَشَب

عَنْ أَبِي سَعِيد الخُدري(رضي الله عنه) أَنَّ رَسُولَ اللّه (ﷺ) قَالَ: ( كَانَ فِي بَنِي إِسْرَائِيلَ امْرَأَةٌ قَصِيرَةٌ، فَصَنَعَتْ رِجْلَيْنِ مِنْ خَشَب، فَكَانَتْ تَسِيرُ بَيْنَ امْرَأَتَيْنِ قَصِيرَتَيْنِ، وَاتَّخَذَتْ خَاتَماً مِنْ ذَهَب وَحَشَتْ تَحْتَ فَصِّه أَطْيَبَ الطِّيبِ الْمِسْكَ، فَكَانَتْ إِذَا مَرَّتْ بِالْمَجْلِسِ حَرَّكَتْهُ فَنَفَحَ رِيحُهُ )[1] .

## چیرۆکی پانزەیەم: ئەو ئافرەتەی دوو پێی داری بۆ خۆی دروستکرد

هاوەڵی خۆشەویست ئەبو سەعیدی خودری (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمووێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: لە بەنی ئیسرائیل ئافرەتێکی کورتە باڵا هەبوو، نەعلی بن بەرزی بۆ خۆی دروست کردبوو لەدار (دوو پێی لە دار بۆ خۆی دروستکرد)، بۆئەوەی باڵای بەرز بێتو لەکاتی ڕۆیشتندا باڵا کورتی پێوە دیار نەبێت، ئینجا کاتێک کە بەنێوان دوو ئافرەتدا دەڕۆیشت، هەروەها بازنگو ئنگوستیلەی ئاڵتونو خرخاڵی پێوە بوو، سەرنجی خەڵکی ڕادەکێشا بۆلای خۆی، وە خۆشترین بۆنی پێوەدەکرد کە میسك بوو، ئینجا هەرکات بەلای کۆمەڵێکدا بڕۆیشتایە کەپیاوانی لێ بوایە ئاڵتونەکەی دەجوڵاندو بۆنی بڵاو دەبووەوە .

---

(١) (صَحِيح) أَخْرَجَهُ أَحْمَد وَصَحَّحَهُ الشَّيْخ الأَلْبَانِي فِي سِلسِلة الأَحَادِيث الصَّحِيحَة (٤٨٦) .

**چەند سوودو ئامۆژگارییەك لەم چیرۆکەدا.**

(١) ئافرەتانی بەدڕەوشت پۆشاكو نەعلو ئەو جۆرە جلو بەرگانە دەپۆشن کە دەبێتە هۆی سەرنج ڕاکێشی خەڵکی .

(٢) حەرامە بۆ ئافرەتی موسڵمان بۆن لەخۆی بداتو بچێتە دەرەوە، ( بەڵام لە ماڵەوە بۆ مێردەکەی دروستە )، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی:
( أَيُّمَا امْرَأَةٍ اسْتَعْطَرَتْ فَمَرَّتْ عَلَى قَوْمٍ لِيَجِدُوا مِنْ رِيحِهَا فَهِيَ زَانِيَةٌ )[1] .

**واتە:** هەر ئافرەتێك بۆن لە خۆی بداتو پاشان لە ماڵ دەرچێتو پیاوانی بێگانە بۆنی ئەو ئافرەتە بکەن ئەوا ئەو ئافرەتە زیناکەرە .

(٣) خراپترینی ئافرەتان ئەوانەن کە جوانی خۆیان دەردەخەن، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ( ... وَشَرُّ نِسَائِكُمُ الْمُتَبَرِّجَاتُ الْمُتَخَيِّلاَتُ وَهُنَّ الْمُنَافِقَاتُ لاَ يَدْخُلُ الْجَنَّةَ مِنْهُنَّ إِلاَّ مِثْلُ الْغُرَابِ الأَعْصَمِ )[2] .

**واتە:** خراپترینی ئافرەتەکانتان، ئەوانەن کە جوانی خۆیان دەردەخەن، وە خۆیان دەڕازێننەوەو لە خۆیان ڕازینو فەخرو شانازی دەکەن بەسەر ئافرەتانی تردا، بەڕاستی ئەوانە خۆیان دەشوبهێنن بە دووڕووەکانەوە، ئەوانە ناچنە بەهەشتەوە مەگەر وەکو قەڵە بازڵە (جۆرێکە لە قەلە ڕەش) نەبێت .

(٤) شارەزایو توانای ئومەتانی پێشو لە دروستکردنی کەلوپەلی گوماناوی، بەوەی ئەو ئافرەتە دوقاچ بۆخۆی دابین دەکاتو خەڵکی پێ فریو دەدات .

(٥) بۆنی میسك لەهەموو بۆنەکانی تر خۆشترە وەکو لە چیرۆکەکەدا هاتووە.

---

(١) (حَسَن) أخرَجَهُ النَّسائي، وَحَسَّنَهُ الشَّيخ الألباني في صَحيح الجَامع (٢٧٠١) .
(٢) (صَحيح) أخرَجَهُ البَيْهَقي وصَحَّحَهُ الشَّيخ الألباني في صَحيح الجَامع (٣٣٣٠) وَفي الصَحيحَة (١٨٤٩) .

## القِصَّة السَّادِسَة عَشر: المَلِكُ الَّذِي فَرَّ مِن الحُكم

عَنْ عَبْد اللَّه بن مَسْعُودٍ (رضي الله عنه) عَنْ الْنبِيّ (ﷺ) قَالَ: إِنَّ بنِي إِسْرَائِيلَ اسْتَخْلَفُوا خَلِيفَةً عَلَيْهِم، بَعْد مُوسَى فقَامَ يُصَلِّي لَيْلَة فَوْقَ بَيْتِ الْمَقْدسِ فِي الْقَمَرِ، فَـذَكَرَ أُمُورًا صَنَعَهَا فَخَرَج، فَتَدَلَّى بِسَبَبَ، فَأَصْبَحَ السَّبَبُ مُعَلَّقًا بِالْمَسْجد وَقَدْ ذَهَبَ، قَالَ: فَانْطَلَقَ حَتَّى أَتَى قَوْمًا عَلَى شَطِّ الْبَحْرِ، فَوَجَدَهُمْ يَضْرِبُونَ أَوْ (يَـصْنَعُون) لَبِنًا، فَسَأَلَهُمْ: كَيْفَ تَأْخُذُونَ عَلَى هَذَا اللَّبِنِ؟ فَأَخْبَرُوهُ، فَلَبِنَ مَعَهُمْ، فَكَانَ يَأْكُلُ مِنْ عَمَلِ يَدِهِ حِيْن الصَّلاة قَام يُصَلِّي، فَرَفَعَ ذَلِكَ الْعُمَالَ إِلَى دِهْقَانِهِمْ، فَقَالَ: أن فِينَا رَجُلاً يَصْنَعُ أَوْ (يَفْعُل) كَذَا وَكَذَا، فَأَرْسَلَ إِلَيْه، فَأَبَى أَنْ يَأْتِيَهُ، ثَلاثَ مَرَّات، ثُمَّ إِنَّهُ جَاءَ يَسِيرُ عَلَى دَابَّتِه فَلَمَّا رَآهُ فَرَّ فَتَبِعَهُ فَسَبَقَهُ فَقَالَ أَنْظِرْنِي أُكَلِّمْكَ كَلِمَةً فَقَامَ حَتَّى كَلَّمَهُ، فَأَخْبَرَهُ خَبَره فَلَمّا أَخْبَرَهُ أَنَّهُ كَانَ مَلِكًا، وَأَنَّهُ فَرَّ مِنْ رَهْبَة رَبِّـه قَالَ: إِنِّي لأَظُنني لَحِقٌ بِكَ، قَالَ: فَاتَّبعه فَعَبَد الله، حَتَى مَاتَا بِرُمَيْلَة مِصْرَ)[1] .

## چیرۆکی شانزەیەم: ئەو پێشەوایەی لە فەرمان ڕەوایی هەڵات

هاوەڵی خۆشەویست عەبدڵلای کوڕی مەسعود (خوایان لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: بەنی ئیسرائیل پێشەوایەکیان بۆ خۆیان دانا لەدوای پێغەمبەر موسا (عليه السلام)، ئەم پێشەوایە پیاوێکی لەخواترس‌و بەویژدان‌و ژیر بوو، کاتێك کەشەو دەهات هەڵدەستا لە (بَيْت الْمَقْدس) نوێژی دەکرد، ئینجا شەوێکیان هەستا بۆ ئەوەی خواپەرستی‌و نوێژ بکات، بیری کردەوە چەند کارێکی کردووە، خوای گەورە بەو کارە ڕازی نەبووە، بۆیە

---

(١) (صَحِيح) أَخْرَجَهُ أَحْمَد وَصَحَّحَهُ الشَّيْخ الأَلْبَانِي فِي سِلسِلة الأَحَادِيث الصَّحِيحَة (٢٨٣٣) .

بڕیاری دا بڕوات و خۆی بشارێتەوەو واز لە پێشەوایەتی بێنێت، ڕۆیشت تاکو گەیشتە شوێنێك کۆمەڵێك کرێکاری بینی لە کەنار ڕوبارێك خەریکی دروستکردنی خشتن، ئینجا پرسیاری کرد لەو کرێکارانە کە بەچەند دروستی دەکەن؟ ئەوانیش هەواڵیان پێدا کەبەچەند دروستی دەکەن، وە ئەمیش وەك ئەوان دەستی کرد بە دروستکردنی خشت، ئینجا وای لێهات کە خواردن و خواردنەوەو بژێوی ڕۆژانەی لەسەر دروستکردنی خشت بڕین بوو، وە ئەگەر کاتی نوێژ بهاتایە، ئەوا دەستی لەکار هەڵ دەگرت و نوێژەکەی دەکرد، بۆیە کرێکارەکان ئەم هەواڵەیان بۆ پادشای وڵات باسکرد، بەوەی کە پیاوێك هەیە بەو شێوەیە کار دەکات، بۆیە پادشاکە ناردی بەشوێنیدا ( چونکە ئەم کارەی پێ سەیر بوو )، بەڵام پیاوەکە نەچوو، تاکوسێ جار پادشا ناردی بەشوێنیدا، ئینجا پادشاکە بەسواری وڵاخەوە هات بۆ لای پیاوەکە ( بۆشوێنی کارەکەی )، پیاوەکە بینی وا پادشاکە دێت بۆلای ڕای کردو هەڵات، پادشاکە بەسواری وڵاخەکەیەوە کەوتە دوای بەڵام بۆی نەگیرا، پادشاکە کەزانی بۆی ناگیرێت بانگی لە پیاوەکە کرد بوەستێت تاکو قسەی لەگەڵدا بکات، پیاوەکە کە گوێی لە پادشاکە بوو ئەو قسەیەی کرد وەستاو باسی بەسەرهاتی خۆی بۆ پادشاکە کرد، پادشاکە زانی ئەم پیاوە پێشەوای قەومەکەی بووەو ڕای کردووە لەدەستیان، بۆیە ووتی: گومانم وایە کە پێت گەیشتم ( چونکە حاڵی ئەم پادشایەش وەکو حاڵی ئەو پیاوە بوو )، ئینجا هەردووکیان پێکەوە وازیان لە پێشەوایی هێناو دەستیان کرد بەخوا پەرستی تاکو پێکەوە لە ڕومەیلەی میصر مردن .

**چەند سوودو ئامۆژگارییەك لەم چیرۆكەدا.**

(١) لەبەنی ئیسرائیل پادشا هەبووە كە حەزوو ئارزوومەندی لە دوارۆژ بووە نەك لە دونیا .

(٢) پێشەوایی‌و كاربەدەستی موسڵمانان كارێكی گەورەیەو پاداشتی زۆری هەیە ئەگەر ئەو پێشەوایە دادپەروەربێت، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ( إنَّ الْمُقْسطِينَ عنْدَ اللَّه عَلَى مَنَابرَ منْ نُورٍ عَنْ يَمِينِ الرَّحْمَنِ عَزَّ وَجَلَّ وَكلْتَا يَدَيْهِ يَمِينٌ الَّذينَ يَعْدلُونَ فِي حُكْمِهِمْ وَأَهْليهِمْ وَمَا وَلُوا )[1] .

**واتە :** پێشەواو فەرمانڕەوایانی دادپەروەر لەلای خوا لە ڕۆژی دواییدا لەسەر مینبەری نورن، لەلای ڕاستی خوای گەورە، كە هەردوو لای خوای گەورە ڕاستە، ئەوانەی كە دادپەروەرن لە فەرمانڕەواییاندا، وە لە ناو كەس‌و كاریاندا، وە لەناو ئەوانەشدا كە سەرپەرشتیان دەكەن.

(٣) شەونوێژ لە ئوممەتانی پێشیشدا هەبووە، ئەم پادشایە شەوانە هەڵ دەسا بۆ شەو نوێژ، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَـٰبِ أُمَّةٌ قَآئِمَةٌ يَتْلُونَ ءَايَـٰتِ ٱللَّهِ ءَانَآءَ ٱلَّيْلِ وَهُمْ يَسْجُدُونَ ﴿١١٣﴾﴾ سورة آل عمران .

---

(١) أخرجه مُسْلِمٌ (٤٦٩٨) .

**واتە:** لە خاوەن کتێبەکان، دەستەیەك لە باوەڕدارنیان هەن کە ئایەتەکانی خوا لەکاتی شەودا دەخوێننەوەو نوێژ دەکەن و سوژدەدەبەن .

(٤) پێویستە مرۆڤی باوەڕدار بیرلەو کارانە بکاتەوە کە ئەنجامیداوە، ئەگەر کاری چاکی ئەنجامدابوو، ئەوا بڵێت بۆ دوارۆژ کەمە ئەو کارە، هەروەها بەکاری خراپە لێپرسینەوە لەگەڵ خۆیدا بکات، چونکە خوای گەورە لە دوارۆژدا لێپرسینەوەی لەگەڵدا دەکات.

(٥) پێویستە مرۆڤی باوەڕدار هەوڵی کارو کەسابەتی حەڵاڵ بدات، وە خۆی بپارێزێت لە حەرامو قەدەغەلێکراوەکان .

(٦) موسڵمانی ژیرو دانا ئەو کەسەیە کە نوێژەکانی لەکاتی خۆیدا بکات، وە بەهۆی کارو کەسابەتەوە نوێژەکانی دوا نەخات .

(٧) بەنی ئیسرائیل جێ نیشینیان هەبووە کە کارو باری بەڕێوەبردون، بێ ئەوەی کە پێغەمبەریش بن .

(٨) ناسینی هەندێك لەو کەلو پەلانەی لەو سەردەمەدا هەبووە کە دروستکراون، وەکو دروستکردنی خشت .

## القِصَّةُ السَّابِعَةَ عَشَر: الرَّجُلُ الَّذِي قَتَلَ نَفْسه مِنْ شِدَّة الأَلَم

عَنْ جُنْدُب بْن عَبْد اللَّه بْنِ سُفْيَانَ الْبَجَلِيُّ (رضي الله عنه)، قَالَ: قَالَ: رَسُولُ اللَّه (ﷺ) كَانَ فِيمَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ رَجُلٌ بِهِ جُرْحٌ، فَجَزِعَ فَأَخَذَ سِكِّينًا فَحَزَّ بِهَا يَدَهُ، فَمَا رَقَأَ الدَّمُ حَتَّى مَاتَ، قَالَ اللَّهُ تَعَالَى: بَادَرَنِي عَبْدِي بِنَفْسِهِ، حَرَّمْتُ عَلَيْهِ الْجَنَّةَ )[1] .

## چیرۆکی حەڤدەیەم: ئەو پیاوەی لەبەر ئازار خۆی کوشت

هاوەڵی خۆشەویست جوندوبی کوڕی عەبدوڵلا (خوای لێ ڕازی بێت) دەفـەرمووێت: پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) فەرموویـەتی: لـە ئوممـەتانی پـێش ئێـوە پیاوێـك برینێکـی هـەبوو، برینەکـەی کێمو زوخمـی هـەبوو، ئـارامی نـەگرت لەسـەر ئازارەکەیو چەقۆیەکی کرد بەناو برینەکەدا بەردەوام خوێنی لێدەهات تـاکو نەزیف بوو ئینجا مرد، پەروەردگار فەرمووی: بەندەکەم پەلەی کـرد لەمردنـدا خۆی کوشت، ئەوا منیش بەهەشتم لێ حەرام کرد.

**چەند سوودو ئامۆژگارییەك لەم چیرۆکەدا.**

(١) خـوای گـەورە بەنـدەکانی خـۆی تـاقی دەکاتـەوە بـە هـەموو شـتێك ( برینداری، برسێتی، کەسوکار مردن، هەژاری...هتد) .

(٢) پێویستە مرۆڤی باوەڕدار ئارامگربێت لەسەر تاقیکردنەوەی پـەروەردگار، چونکە لەسەر تاقیکردنەوەی ژیانی دونیا پاداشتی گەورەی دەدرێتەوە .

(٣) خوای گەورە خۆ کوشتنی حەرام کردووە.

(٤) لەدونیادا بەچی خۆت بکوژێت لەقیامەتدا بەردەوام بەوشتە سزا دەدرێت .

---

(١) أخرَجَهُ البُخَارِيُّ (٣٤٦٣) .

## القِصَّة الثَّامِنَة عَشَر: المَرْأَةُ الَّتِي دَخَلَتْ النَّارَ بِسَبَبِ هِرَّة

عَنْ ابْنِ عُمَرَ (رضي الله عنه) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: ( عُذِّبَت امْرَأَةٌ فِي هِرَّةٍ سَجَنَتْهَا حَتَّى مَاتَتْ فَدَخَلَتْ فِيهَا النَّارَ لاَهِيَ أَطْعَمَتْهَا وَلاَ سَقَتْهَا إِذْ حَبَسَتْهَا وَلاَ هِيَ تَرَكَتْهَا تَأْكُلُ مِنْ خَشَاشِ الأَرْض )[1] .

## چیرۆکی هەژدەیەم: ئەو ئافرەتەی بەهۆی پشیلەیەکەوە چووە ئاگرەوە

هاوەڵی خۆشەویست عەبدڵلای کوڕی عومەر (خوایان لێ ڕازی بێت) دەفەرمووێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ئافرەتێك سزا دەدرا لەسەر پشیلەیەك، بەندی کردبوو تاکو مرد، بەهۆیەوە خرایە دۆزەخەوە، نە ئەوەبوو خۆراكو ئاوی بداتێ، وە نە وازی لێ دەهێنا بۆ خۆی پەلەوەری سەر زەوی بخوات .

**چەند سوودو ئامۆژگارییەك لەم چیرۆکەدا .**

(١) گەورەیی تاوانی ئەوانەی ئازاری ئاژەڵان دەدەنو دەیان کوژن .

(٢) دروستە ڕاگرتنو بەندکردنی پشیلەو هەموو جۆرە ئاژەڵێك، بەمەرجێك فەرامۆش نەکرێت لە خواردنو ئاو، بەتایبەتی ئەو ئاژەڵانەی کوێرو نوقستانو ناتەواون .

(٣) هەرکەسێك ئاژەڵێك ئازار بدات لە دونیادا لە دواڕۆژدا ئەو ئاژەڵە ئەوکەسە سزا دەداتەوە .

(٤) ئەم چیرۆکە بەڵگەی هەبوونو ئامادەیی دۆزەخە لە ئێستادا، کە ئەمیش مەزهەبی ئەهلی سوننەو جەماعەیە .

---

(١) أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ (٣٤٨٢)، ومُسْلِمٌ (٥٨١٣) .

**القِصَّةُ التَّاسِعَةَ عَشَر: المُتَصَدِّقُ الَّذِي وَضَعَ الصَّدَقَةَ فِي غَيْرِ مَوْضِعِهَا**

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: ( قَالَ: رَجُلٌ لأَتَصَدَّقَنَّ اللَّيْلَةَ بِصَدَقَةٍ، فَخَرَجَ بِصَدَقَتِه فَوَضَعَهَا فِي يَدِ سَارِقٍ، فَأَصْبَحُوا يَتَحَدَّثُونَ تُصُدِّقَ عَلَى سَارِقٍ، فَقَالَ: اللَّهُمَّ لَكَ الْحَمْدُ لأَتَصَدَّقَنَّ اللَّيْلَةَ بِصَدَقَةٍ، فَخَرَجَ بِصَدَقَتِه فَوَضَعَهَا فِي يَدَيْ زَانِيَةٍ، فَأَصْبَحُوا يَتَحَدَّثُونَ تُصُدِّقَ اللَّيْلَةَ عَلَى زَانِيَةٍ، فَقَالَ: اللَّهُمَّ لَكَ الْحَمْدُ عَلَى زَانِيَةٍ، لأَتَصَدَّقَنَّ اللَّيْلَةَ بِصَدَقَةٍ، فَخَرَجَ بِصَدَقَتِه فَوَضَعَهَا فِي يَدَيْ غَنِيٍّ، فَأَصْبَحُوا يَتَحَدَّثُونَ تُصُدِّقَ عَلَى غَنِيٍّ فَقَالَ اللَّهُمَّ لَكَ الْحَمْدُ، عَلَى سَارِقٍ وَعَلَى زَانِيَةٍ وَعَلَى غَنِيٍّ، فَأُتِيَ، فَقِيلَ لَهُ: أَمَّا صَدَقَتُكَ عَلَى سَارِقٍ، فَلَعَلَّهُ أَنْ يَسْتَعِفَّ عَنْ سَرِقَتِه، وَأَمَّا الزَّانِيَةُ فَلَعَلَّهَا أَنْ تَسْتَعِفَّ عَنْ زِنَاهَا، وَأَمَّا الْغَنِيُّ فَلَعَلَّهُ يَعْتَبِرُ فَيُنْفِقُ مِمَّا أَعْطَاهُ اللَّهُ)[1] .

**چیرۆکی نۆزدەیەم: ئەو خێرمەندەی خێرەکەی لە شوێنی خۆیدا نەبوو**

هاوەڵی خۆشەویست ئەبو هورەیرە (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمووێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: پیاوێك ووتی: سوێند بەخوا ئەمشەو خێرێك دەکەم، کاتێك شەو هاتە دەرەوە خێرەکەی کردە ناو دەستی دزێکەوە (بەڵام نەی زانی کە دزە)، کە بەیانی بووەوە لەناو خەڵکیدا باسی ئەوە دەکرا کە ئەم شەو خێر بە دز دراوە، پیاوەکەش ووتی: خوایە سوپاس و ستایش بۆتۆ، کە ئەو خێرە بۆ ئەو دزە بوو ئەویش بە ویستی خوایە نەك بە ویستی من، چونکە ویست و

---

(١) أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ (١٤٢١)، وَمُسْلِمٌ (٢٣٥٩) .

فەرمانەکانی تۆ هەموویان جوانن)، دووبار ووتی: سوێند بەخوا ئەم شەو خێردەکەم، شەو هاتە دەرەوە ئەم جارەیان خێرەکەی کرد بە داوێن پیسێك، دیسان کە بەیانی بووەوە لەناو خەڵکیدا باسی ئەوە دەکرا کە ئەم شەو خێر بە داوێن پیس دراوە، پیاوەکەش ووتی: خوایە سوپاسو ستایش بۆ تۆ، کە ئەو خێرە بۆ ئەو داوێن پیسە بوو (ئەویش بە ویستی خوایە نەك ویستی من، چونکە ویستو فەرمانەکانی تۆ هەموویان جوانن)، جاری سێیەم ووتی: سوێند بەخوا ئەم شەو خێردەکەم، شەو هاتە دەرەوە بەڵام ئەم جارەیان خێرەکەی دا بە دەوڵەمەندێك، دیسان کە بەیانی بووەوە لەناو خەڵکیدا باسی ئەوە دەکرا کە ئەم شەو خێر بە دەوڵەمەندێك کراوە، پیاوەکەش ووتی: خوایە سوپاسو ستایش بۆ تۆ، کە ئەو خێرە بۆ ئەو دەوڵەمەندە بوو (ئەویش بە ویستی خوایە نەك ویستی من، چونکە ویستو فەرمانەکانی تۆ هەموویان جوانن)، پیاوەکە شەو خەونی بینی کە مەلائیکەتێك لە خەودا پێی ووت: بەڵام ئەو خێرەی کە کردت بە دزەکە ئومێد دەکرێتو دەگونجێت کە دەست هەڵبگرێتو واز لە دزی بهێنێت، وە ئەو خێرەی کە کردت بە داوێن پیسەکە ئومێد دەکرێتو دەگونجێت کە واز لە داوێن پیسی بهێنێت، وە ئەو خێرەی کە کردت بە دەوڵەمەندەکە ئومێد دەکرێتو دەگونجێت کە بەهۆی ئەو کارەوە پەندو ئامۆژگاری وەربگرێتو ببەخشێت لەوەی کە خوای گەورە پێی بەخشیوە .

**چەند سوودو ئامۆژگارییەك لەم چیرۆکەدا .**

(١) لە ناو هەموو نەتەوەیەکدا پیاو چاكو صالح هەیە کە تامەزرۆی خێرو صەدەقەن، بۆ بەدەست هێنانی ڕەزامەندی خوای پەرەردگار، هەروەها بەهیوای هیچ پاداشتو ستایشی بەندەکانی خوای پەروەردگار نین .

(٢) فراوانی بەزەیی‌و میهرەبانی خوای پەروەردگار بۆ قەبوڵ بوونی خێرو صەدەقە، ئەگەرچی نەکەوێتە دەست ئەوانەی شایستەن .

(٣) نییەت پاکی گەورەترین هۆکارە بۆ گیرابوونی کردەوە چاکەکان.

(٤) فەزڵو گەورەیی ماڵ بەخشین، بەتایبەتی ماڵ بەخشینی نهێنی .

(٥) خێرو ماڵ بەخشینی نهێنی‌و شاراوە تورە بوونی خوای گەورە لادەبات.

(٦) ڕازی بوون بەقەدەری خوای گەورەو سوپاس‌و ستایشکردنی پەروەردگار لەهەموو کاتێکدا، بەتایبەتی لە کاتی ناخۆشیدا .

(٧) دوو بارەکردنەوەی خێرو صەدەقە ئەگەر زانرا نەدراوە بە هەژارو کەسانی موستەحەق‌و شیاو .

(٨) زۆر جار کردەوەی چاکی موسڵمان کاریگەری چاكو باش بەرهەم دەهێنێت، بەشێوەیەك خاوەنەکەی نەیویستووە، وە پەروەردگار پاداشتی دەداتەوە لەسەری، ئەو پیاوە نەی دەویست خێر بکات بە دزو داوێن پیس‌و دەوڵەمەند، بەڵام پەروەردگار کارەکەی لێ وەرگرت.

(٩) خەوی خۆش‌و چاك لەو خەوانەیە کە مژدەی خۆش دەدەن بە موسڵمانان، هەروەها خەوی خۆش‌و چاك بەشێکە لە چل‌و شەش بەشی پێغەمبەرایەتی .

## الْقِصَّةُ الْعِشْرُون: الرَّجُلَ الَّذِي أَحَبَّه اللهُ لِحُبِّ أَخِيهِ

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) أَنَّ رَجُلاً زَارَ أَخًا لَهُ فِي قَرْيَةٍ أُخْرَى، فَأَرْصَدَ اللَّهُ لَهُ عَلَى مَدْرَجَتِهِ مَلَكًا، فَلَمَّا أَتَى عَلَيْهِ، قَالَ: أَيْنَ تُرِيدُ؟ قَالَ: أُرِيدُ أَخًا لِي فِي هَذِهِ الْقَرْيَةِ، قَالَ: هَلْ لَكَ عَلَيْهِ مِنْ نِعْمَةٍ تَرُبُّهَا، قَالَ: لاَ، غَيْرَ أَنِّي أَحْبَبْتُهُ فِي اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ، قَالَ: فَإِنِّي رَسُولُ اللَّهِ إِلَيْكَ بِأَنَّ اللَّهَ قَدْ أَحَبَّكَ كَمَا أَحْبَبْتَهُ فِيهِ )[1] .

## چیرۆکی بیستو یەکەم: ئەو پیاوەی پەروەردگار خۆشی دەویست

هاوەڵی خۆشەویست ئەبو هورەیرە (خوایان لێ ڕازی بێت) دەفەرمووێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: پیاوێـک چـوو بـۆ سـەردانی برایەکی لـە گونـدێکی تـر، خـوای گـەورە لەسـەر ڕێگـەی ئـەو پیـاوە مەلائیکـەتێکی دانـا، کاتێـک پیاوەکـە گەیـشتە لای، مەلائیکەتەکـە بـە پیاوەکـەی ووت: بـۆ کـوێ دەچـیت؟ پیاوەکـەش ووتـی: دەمـەوێت بـچم بـۆلای برایـەکم لـەم گونـدە، مەلائیکەتەکـە ووتـی: ئایـا لـەلای ئـەو برایـەت هـیچ خێـرو بەرژەوەندییـەکت لای دەسـت دەکـەوێت؟ پیاوەکـە ووتـی: نـەخێر، تـەنها ئـەوە نـەبێت کـە مـن لەبـەر خـاتری خـوای گـەورە ئـەوم خـۆش دەوێـت، مەلائیکەتەکـە ووتـی: بەڕاسـتی مـن نێـردراوی خـوای گـەورەم بـۆلای تـۆ کـە پێـت بڵـێم خـوای گـەورە تـۆی خـۆش دەوێـت، وەك چۆن تۆ ئەو برایەت خۆش دەوێت لەبەر خاتری خوای گەورە.

---

(١) أخرجه مُسْلِمٌ (٦٤٩٥) .

**چەند سوودو ئامۆژگارییەك لەم چیرۆکەدا.**

(١) فەزڵو گەورەیی سەردانیکردنو خۆشەویستن لەبەر خاتری پەروەردگار .

(٢) باوەڕداران برای یەکترین: ﴿ إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ ﴿١٠﴾ ﴾ سورة الحجرات .

**واتە:** بەڕاستی تەنها باوەڕداران برای یەکترین، هەروەها پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ( الْمُؤْمِنُ أَخُو الْمُؤْمِنِ )[1] واتە: باوەڕدار برای باوەڕدارە.

(٣) خۆشەویستی لەبەر خوا هۆکارە بۆ بەدەست هێنانی خۆشەویستی خوا

(٤) هەرباوەڕدارێك لەبەر خوا باوەڕدارێکی خۆش بووێت ئەوا ئەو کەسە ڕێزی لە خوای گەورە گرتووە .

(٥) هەرکەسێکت خۆش بووێت لە دونیادا لە قیامەتیشدا لەگەڵ ئەودادەبیت، پیاوێك پرسیاری کرد لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) سەبارەت بە قیامەت؟ ئەویش فەرموویەتی: چیت بۆ ئامادەکردووە، پیاوەکەش ووتی: خۆشەویستی خواو پێغەمبەرەکەی، ئەویش فەرمووی: (إِنَّكَ مَعَ مَنْ أَحْبَبْت)[2] واتە: تۆ لەگەڵ خۆشەویستتدایت .

(٦) مەلائیکەت داوای لێخۆش بوون بۆ ئەو کەسانە دەکەن کە لەبەر خوا یەکتریان خۆش دەوێت .

(٧) خۆشەویستی لەبەر خوا هۆکارە بۆ ڕزگار بوون لە ناڕەحەتی قیامەت .

(٨) خۆشەویستی لەبەر خوا نیشانەیە بۆ چێژ وەرگرتنو تەواوێتی باوەڕ .

---

(١) أخرَجَه مُسْلِمٌ (٣٤٤٩) .

(٢) أخرَجَه البُخَارِيُّ (٣٦٨٨)، ومُسْلِمٌ (٦٦٥٥) .

## القِصَّة الحَادِيَة وَالعِشْرُون:الرَّجُلَ الَّذِي افْتَخَر بِآبَائِهِ الكَفَرَة

عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْب (رضي الله عنه) قَالَ قَالَ: رَسُول اللَّه (ﷺ) انْتَسَبَ رَجُلَانِ عَلَى عَهْدِ مُوسَى (عليه السلام) فَقَالَ: أَحَدُهُمَا أَنَا فُلَانُ بْنُ فُلَانٍ حَتَّى عَدَّ تِسْعَةً فَمَنْ أَنْتَ لَا أُمَّ لَكَ؟ قَالَ: أَنَا فُلَانُ بْنُ فُلَانٍ ابْنُ الإِسْلَامِ، فَأَوْحَى اللَّهُ إِلَى مُوسَى (عليه السلام) أَنَّ قُلْ: لِهَذَيْنِ الْمُنْتَسِبَيْنِ: أَمَّا أَنْتُ أَيُّهَا الْمُنْتَسِبُ إِلَى تِسْعَةٍ فِي النَّارِ، فَأَنْتَ عَاشِرُهُمْ فِي النَّارِ، وَأَمَّا أَنْتَ أَيهَا الْمُنْتَسِبُ إِلَى اثْنَيْنِ فِي الْجَنَّةِ فَأَنْتَ ثَالِثُهُمَا فِي الْجَنَّةِ )[1] .

## چیرۆکی بیستو دووەم: ئەو پیاوەی شانازی دەکرد بەباو باپیرە بێ باوەڕەکانی

هاوەڵی خۆشەویست ئوبەی کوڕی کەعب (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمووێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: دوو پیاو نەژادو ڕەچەڵکی خۆیان باسکرد لەسەردەمی پێغەمبەر موسادا(عليه السلام)، یەکێکیان ووتی: من فلانی کوڕی فلانم تاکو نۆ پشتی خۆی ژمارد (فەخرو شانازی کرد بەسەریدا)، ئینجا بە پیاوەکەی تری ووت: تۆ کێی دایکت نییە (بەچاوێکی سوکو ڕیسوایی سەیری کرد)؟ ئەویش ووتی: من فلانی کوڕی فلانمو کوڕی ئیسلامم، خوای گەورە سروشی بۆ پێغەمبەر موسا(عليه السلام)، نارد کە بەو دوو پیاوە بڵێت: باسی نەژادو ڕەچەڵەکی خۆیان کرد، ئەویان کە تاکو نۆ پشتی ژمارد هەر نۆیان لە ئاگردانو ئەویش دەیەمیانە، وە ئەوەیان کە دوو پشتی خۆی ژمارد هەر دووکیان لە بەهەشتدانو ئەویش سێ یەمیانە لەبەهەشتدا.

---

(١) (صَحِيح) أخرَجَه أحْمَد وَصَحَّحَهُ الشَّيْخ الألْبَانِي فِي صَحِيح الْجَامِع (١٤٩٢) .

**چەند سوودو ئامۆژگارییەك لەم چیرۆکەدا.**

(١) ڕێگری‌و قەدەغەی لە فەخرو شانازی کردن بەباو باپیران لە شوێن کەوتنیان لەسەر کارە پڕو پوچ‌و ناحەقەکانیان.

(٢) خوای گەورە کەسانێکی خۆش ناوێت فەخرو شانازی بکەن بەسەر خەڵکیدا

(٣) نەژادو ڕەچەڵەك سوود بەکەس ناگەیەنێت لە دوارۆژدا، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ( وَمَنْ بَطَّأَ بِهِ عَمَلُهُ لَمْ يُسْرِعْ بِهِ نَسَبُهُ )[1]

**واتە:** هەرکەسێك لە ڕۆژی دواییدا کردەوەی خراپی هەبێت‌و دوای بخات، ئەوا ئەو کەسە نەژادو ڕەچەڵەکی سوودی پێناگەیەنن‌و پێشی ناخات‌و نایکاتە بەهەشتەوە.

(٤) بەڕێزترین کەس لای خوای گەورە ئەو کەسەیە کە لەخوا ترسە

---

(١) أخرجه مسلم (٦٧٩٣) .

## القِصَّة الثَّانِيَة وَالعِشْرُون: الرَّجُلُ الَّذِي يَتَأَلَّى عَلَى اللهِ

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يَقُولُ: كَانَ رَجُلاَنِ فِي بَنِي إِسْرَائِيلَ مُتَآخِيَيْنِ، فَكَانَ أَحَدُهُمَا يُذْنِبُ، وَالآخَرُ مُجْتَهِدٌ فِي الْعِبَادَةِ فَكَانَ لاَ يَزَالُ الْمُجْتَهِدُ يَرَى الآخَرَ عَلَى الذَّنْبِ، فَيَقُولُ أَقْصِرْ، فَوَجَدَهُ يَوْمًا عَلَى ذَنْبٍ، فَقَالَ لَهُ أَقْصِرْ؟ فَقَالَ خَلِّنِي وَرَبِّي أَبُعِثْتَ عَلَيَّ رَقِيبًا، فَقَالَ وَاللَّهِ لاَ يَغْفِرُ اللَّهُ لَكَ، أَوْ لاَ يُدْخِلُكَ اللَّهُ الْجَنَّةَ، فَقُبِضَ أَرْوَاحُهُمَا، فَاجْتَمَعَا عِنْدَ رَبِّ الْعَالَمِينَ، فَقَالَ لِهَذَا الْمُجْتَهِدِ، أَكُنْتَ بِي عَالِمًا؟ أَوْ كُنْتَ عَلَى مَا فِي يَدِي قَادِرًا؟ وَقَالَ لِلْمُذْنِبِ اذْهَبْ فَادْخُلِ الْجَنَّةَ بِرَحْمَتِي، وَقَالَ لِلآخَرِ اذْهَبُوا بِهِ إِلَى النَّارِ )[1].

## چیرۆکی بیستو سێیەم: ئەو پیاوەی لە جیاتی خوای گەورە بڕیاری دا

هاوەڵی خۆشەویست ئەبو هورەیرە (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمووێت: گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەیفەرموو: دوو پیاو هەبوو لەبەنی ئیسرائیل وەك برا بوون یەكێكیان تاوان كار بوو ئەوی تریشیان كۆششی دەكرد لە خواپەرستی دا، بەردەوام خواپەرستەكە براكەی دەبینی لەسەر تاوان پێی دەووت: دەست هەڵگرە لە تاوان بەسە، ڕۆژێكیان بینی لەسەر تاوانێك، ئەویش پێی ووت: دەست هەڵگرە؟ تاوان كارەكەش ووتی: وازم لێ بێنە توخوا خۆم‌و خوای خۆم، ئایا تۆ نێردراوی بە چاودێر بەسەر منەوە؟ خوا پەرستەكەش پێی ووت: سوێند بەخوا خوا لێت خۆش نابێت، یان خوا ناتكاتە بەهەشتەوە ڕوحیان كێشرا، هەردووكیان گەڕانەوە لای پەروەردگار،

---

(١) (صَحِيح) أَخْرَجَه أَبودَاوُد وَصَحَّحَهُ الشَّيْخ الأَلْبَانِي فِي صَحِيح الجَامِع (٤٤٥٥) .

پەروەردگار بە خواپەرستەکەی فەرموو: ئایا تۆ زانیاریت هەبوو بەوەی کە من لێی خۆش نابم؟ پاشان بە تاوانکارەکەی فەرموو: بڕۆ بۆبەهەشت بەرەحمو بەزەیی خۆم، وە بە خوا پەرستەکەشی فەرموو: بیبەن بۆ دۆزەخ.

**چەند سوودو ئامۆژگارییەك لەم چیرۆکەدا.**

(١) پێویستە مرۆڤی باوەڕدار ئاگاداربێت خوای گەورە لە خۆی توڕە نەکات، وە لە جیاتی خوای گەورە بڕیار نەداتو بەناوی ئەوەوە قسەنەکات .

(٢) پێویستە لەسەر مرۆڤی موسڵمان لە وێستگەی بەندایەتیدا ڕابوەستێو کار بەفەرمانی خوا بکات، ئارامگربێت لەسەر بانگەوازو بانگێشت کردنی خەڵکیو پەلە نەکات لە حوکمدان بەسەریاندا .

(٣) دەبێت باوەڕدار بەو خواپەرستیەی کە دەیکات لە خۆی بایی نەبێت .

(٤) مرۆڤی باوەڕدار هەرکاتێك قسە دەکات پێویستە بیر لەسەر ئەنجامەکەی بکاتەوە، چونکە بەند هەیە قسەی وادەکات خوای گەورە بەهۆی ئەو قسەیەوە دەیباتە خوارەوە بە ناو ئاگردا .

(٥) کەسانێك هەن گومانیان وایە خەڵکی هەموویان بەهیلاك چوونو خۆیشی ڕزگاری بووە، بەڵام لە ڕاستیدا ئەو کەسە خۆی بەهیلاك چووە .

(٦) خوای گەورە لە هەموو تاوانو گوناهێك خۆش دەبێت ئەگەر ویستی لێبێت جگە لە شیرك، بەڕاستی خوای گەورە لەکەسێك خۆش نابێت کە هاویەشی بۆ بڕیار بدات، بەڵام لەو بچوکتر هەر تاوانێك بێت خۆش دەبێت بۆ هەرکەسێك کە ویستی لێبێتو شایەنی ئەو لێخۆش بوونە بێت .

(٧) ترسان لە عاقیبەتی خراپ .

**ڕوونکردنەوەیەک:**

**زانای پایەبەرز شێخ ابنُ العُثَيمين** (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرمووێت: ئێمە شایەتی بۆ هەموو باوەڕدارێك دەدەین کە لەبەهەشتدایە، بەڵام ئەگەر کەسێکمان بینی نوێژ دەکاتو زەکات دەداتو ڕۆژوو دەگرێتو حەج دەکاتو خێرو صەدەقە دەکاتو چاکەکارەو گوێڕایەڵی دایكو باوکێتیو سەردانی خزمو ناسیاری دەکات، ئەوا شایەتی بۆ نادەین کە ئەو کەسە لەبەهەشتدایە، چونکە ئێمە بۆمان نییە هیچ کەسێك دەستنیشان بکەین، وە ئەگەر پیاوێکی بێ باوەڕو یاخی مان بینیو قورئانی دەدڕانو دەیخستە ژێر پێیەوەو گاڵتەی بە خوای گەورەو پێغەمبەر(ﷺ) دەکرد، ئەوا نالێین: ئەو کەسە لە ئاگردایە، بەڵکو دەڵێین هەر کەس ئەو کارە بکات ئەوە لە ئاگردایە، بەبێ دەست نیشانکردن، چونکە دەگونجێت ئەو کەسە لە کۆتایی ژیانیدا خوای گەورە منەتی بەسەردا بڕێژێتو هیدایەتی بدات، وە تۆ نازانیت، بۆیە دەبێت جیاوازی بکرێت لە نێوان (التعيين والإطلاق، أوالتعيين والإجمال)، بۆیە بیروباوەڕی (ئەهلی سوننەو جەماعە) ئەوەیە کە شایەتی بۆ هیچ کەس نەدرێت کە لە بەهەشتدایە، وە شایەتیش بۆ هیچ کەس نەدرێت کە لە ئاگردایە، جگە لەوەی کە خوای گەورەو پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەست نیشانی کردوونو شایەتی بۆ داون[1] .

---

(١) بڕوانە: تەفسیری جوزئی زاریات ئایەتی (يُؤْفَكُ عَنْهُ مَنْ أُفِكَ)، الشَّيْخ / مُحَمّد بن صَالِح العُثَيمين .

## الْقِصَّةُ الثَّالِثَةُ وَالْعِشْرُونَ: مُوسَى (عليه السلام) وَ مَلَكُ الْمَوْتِ

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) عَنْ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: أُرْسِلَ مَلَكُ الْمَوْتِ إِلَى مُوسَى (عليه السلام) فَلَمَّا جَاءَهُ صَكَّهُ فَفَقَأَ عَيْنَهُ فَرَجَعَ إِلَى رَبِّهِ فَقَالَ أَرْسَلْتَنِي إِلَى عَبْدٍ لاَ يُرِيدُ الْمَوْتَ، قَالَ: فَرَدَّ اللَّهُ إِلَيْهِ عَيْنَهُ وَقَالَ: ارْجِعْ إِلَيْهِ فَقُلْ لَهُ: يَضَعُ يَدَهُ عَلَى مَتْنِ ثَوْرٍ، فَلَهُ بِمَا غَطَّتْ يَدُهُ بِكُلِّ شَعْرَةٍ سَنَةٌ، قَالَ: أَيْ رَبِّ ثُمَّ مَهْ قَالَ: ثُمَّ الْمَوْتُ، قَالَ: فَالآنَ فَسَأَلَ اللَّهَ أَنْ يُدْنِيَهُ مِنَ الأَرْضِ الْمُقَدَّسَةِ رَمْيَةً بِحَجَرٍ، فَقَالَ: رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) فَلَوْ كُنْتُ ثَمَّ لأَرَيْتُكُمْ قَبْرَهُ إِلَى جَانِبِ الطَّرِيقِ تَحْتَ الْكَثِيبِ الأَحْمَرِ[1]

## چیرۆکی بیستو سێ یەم: پێغەمبەر موسا (عليه السلام) وە مەلائیکەی گیان کێشان

هاوەڵی خۆشەویست ئەبو هورەیرە (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: مەلائیکەی گیان کێشان نێردرا بۆلای موسا (عليه السلام) (لەسەر شێوەی مرۆڤ)، جا کاتێك هات بۆلای زللەیەکی لێداو چاوی کوێر کرد، مەلائیکەتەکە گەڕایەوە بۆلای خوای گەورەو فەرمووی: منت ناردووە بۆلای بەندەیەك مردنی ناوێت، خوای پەروەردگار چاوی بۆ گێڕایەوەو فەرمووی: بگەڕێرەوە بۆلای و پێی بڵێ: با دەست بخاتە سەر پشتی گایەك، چەند تاڵ موو کەوتە ژێر دەستیەوە ئەوەندە ساڵ دەژیت، ئەویش فەرمووی: ئەی دوای ئەوەندە ساڵە؟ فەرمووی: دوای ئەوە دەمریت، پێغەمبەر موسا (عليه السلام) فەرمووی: دەی ئێستا بابمرم داوابکە لە خوای پەروەردگار نزیکم بکاتەوە لەخاکی پیرۆز بەئەندازەی بەرد هاوێژێك، وە

---

(١) أخرجه البخاري (٣٤٠٧)، ومسلم (٦١٠١) .

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ئەگەر لەلای ئەو بوایەم، ئەوا قەبرەکەیم نیشان دەدان وا لە کەناری ڕێگەکەدا لەژێر کۆمەڵە لمێکی سوردایە .

**چەند سوودو ئامۆژگارییەك لەم چیرۆکەدا.**

(١) مەلائیکە لەسەر شێوەی مرۆڤەکان دێن بۆ سەر زەوی بۆلای مرۆڤەکان .

(٢) مردن ڕێگەیەکی حەتمیەو هەموو مرۆڤێكو خاوەن نەفسێك دەمرێت .

(٣) مرۆڤەکان حەز بەمردن ناکەنو مردنیان پێ ناخۆشە، بەڵام لە ڕاستیدا مردن باشترە بۆ باوەڕدار لە توش بوون بە فیتنەو گومڕاییو تاوانو گوناه .

(٤) پێغەمبەران لە کاتی مردنیاندا موخەیەرو سەرپشك دەکرێن، لە نیوان مردنو ژیاندا .

(٥) فەزڵو گەورەیی ناشتن لە خاکی پیرۆز (الأَرْضِ الْمُقَدَّسَةِ) .

(٦) قەبرەکەی پێغەمبەر موسا (عليه السلام) لە خاکی پیرۆز، وە پێغەمبەری خوا (ﷺ) شوێنەکەی زانیوەو هەندێك نیشانەی باسکرد لەسەری .

(٧) فەزڵو گەورەیی پێغەمبەر موسا (عليه السلام) لەلای خوای گەورە، ئەوە بو بەیەك زلە چاوی مەلائیکەی گیان کێشانی کوێر کرد، جا ئەگەر پێغەمبەر موسا (عليه السلام) لەلای خوای گەورە بەڕێز نەبوایە، ئەوا مەلائیکەی گیان کێشان تۆڵەی لێ دەسەندەوە .

(٨) کوێر کردنی چاوی مەلائیکەی گیان کێشان لەلایەن پێغەمبەر موساوە (عليه السلام) واتە: ئەو چاوە ئادەمییەی کە لەسەر شێوەکەی خۆی نیشاندابوو، چونکە ئەگەر لەسەر شێوەی مەلائیکەت خۆی نیشان بدایە، ئەوا نەیدەتوانی زللەی لێ بدات و توانای نە دەبوو بە سەریدا .

**ڕونکردنەوەیەک:**

هەندێك لەبیدەعەچی‌و گومڕاکان دەڵێن: چۆن دەبێت پێغەمبەر موسا (عليه السلام) چاوی مەلائیکەی ڕۆح کێشان کوێر بکات، بۆ وەڵامی ئەم شوبهەیە دەچینە لای پێشەوا نەوەوی (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) وتەی زانایانمان پێ ڕادەگەیێنێت، دەفەرموێت: زانایان وەڵامی ئەم شوبهەیەیان داوەتەوە بە چەند وەڵامێك، لەوانە:

**یەکەم:** هیچ ڕێگرییەك نییە کە خوای گەورە ڕێگەی پێدابێت بەوەی کە چاوی کوێر بکات، وە دەگونجێت تاقیکردنەوەیەك بێت بۆ مەلائیکەی ڕۆح کێشان، هەروەها خوای گەورە ویستی چۆن بێت هەر ئەوە دەبێت .

**دووەم:** پێغەمبەر موسا (عليه السلام) نەیزانی کە ئەو مەلائیکەی گیان کێشانەو لەلای خوای گەورەوە نێردراوە، بەڵکو وای زانی کە پیاوێکی بێگانەیەو بۆ زیان پێگەیاندنی هاتووە، بۆیە ئەویش بەرگری لە خۆی کردووە، وە نەیشی ویستووە کە کوێری بکات، چونکە، زللە یەکی لێداوە ( صَكَّهُ أي لَطَمهُ )، ئەمەش بۆچوونی ئیمامی ئەبو بەکری کوڕی خوزەیمەو جگە لەوانیشە .

هەروەها ( الْمَـازِرِيّ و الْقَاضِـي عِيَـاض ) دەفەرموون: هیچ بەڵگەیەك نییە کە پێغەمبەر موسا (عليه السلام) بە ئەنقەست چاوی کوێر کردبێت، وە ئەگەر بووترێت: ئەی جاری دووەم پێغەمبەر موسا (عليه السلام) دانی پێدانا کە ئەو مەلائیکەی ڕۆح کێشانە؟ وەڵامی دەدەینەوە بەوەی کە جاری دووەم هاتەوە بۆلای نیشانەی پێی بوو کە دەناسرایەوە مەلائیکەی ڕۆح کێشانە، بۆیە خۆی دایە دەستی‌و تەسلیم بوو، خوای گەورە لە هەموو کەس زاناترە[١].

---

(١) بڕوانە: شَرْح النَّوَوِيّ عَلى مُسْلِمْ (٨/١٠٣/٤٣٧٤) .

هەروەها پێشەوا ئیبنو حەجەر (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) زانیارییەکی ترمان دەداتێ بەوەی کە دەفەرمووێت: دەڵێت: پێغەمبەران لە کاتی مردنیاندا موخەیەر دەکرێن، لە نیوان مردن‌و ژیاندا، ئەمیش ئاگادار نەکراوەتەوە پێش مردنی، بۆیە جاری دووەم کە ئاگادار کرایەوەو موخەیەر کراو مەلائیکەتەکە خۆی ناساند ئەمیش خۆی دایە دەستی‌و تەسلیم بوو، وەئەم ووتەیە لە هەموویان بەهێزترەو نزیکترە لە ڕاستیەوە، خوای گەورەش لە هەموو کەس زاناترە[1].

---

(١) بڕوانە: فَتح البَارِي شَرْح صَحِيح البُخَارِيُّ (١٠/٢٠٤/٣١٥٥) .

**القِصَّة الرَّابِعَة وَالعِشْرُون: الحَجَرُ الَّذِي فَرَّ بِثَوْب مُوسَى (عليه السلام)**

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) قَالَ: قَالَ: رَسُولُ اللَّه (ﷺ) إِنَّ مُوسَى كَانَ رَجُلاً حَيِيًّا سِتِّيرًا، لاَ يُرَى مِنْ جِلْده شَيْءٌ اسْتِحْيَاءً مِنْهُ، فَآذَاهُ مَنْ آذَاهُ مِنْ بَنِي إِسْرَائِيلَ، فَقَالُوا مَا يَسْتَتِرُ هَذَا التَّسَتُّرَ إِلاَّ مِنْ عَيْب بِجِلْده، إِمَّا بَرَصٌ وَإِمَّا أُدْرَةٌ وَإِمَّا آفَةٌ، وَإِنَّ اللَّهَ أَرَادَ أَنْ يُبَرِّئَهُ مِمَّا قَالُوا لِمُوسَى فَخَلاَ يَوْمًا وَحْدَهُ فَوَضَعَ ثِيَابَهُ عَلَى الْحَجَرِ ثُمَّ اغْتَسَلَ، فَلَمَّا فَرَغَ أَقْبَلَ إِلَى ثِيَابِهِ لِيَأْخُذَهَا، وَإِنَّ الْحَجَرَ عَدَا بِثَوْبِهِ، فَأَخَذَ مُوسَى عَصَاهُ وَطَلَبَ الْحَجَرَ، فَجَعَلَ يَقُولُ ثَوْبِي حَجَرُ، ثَوْبِي حَجَرُ، حَتَّى انْتَهَى إِلَى مَلإٍ مِنْ بَنِي إِسْرَائِيلَ، فَرَأَوْهُ عُرْيَانًا أَحْسَنَ مَا خَلَقَ اللَّهُ، وَأَبْرَأَهُ مِمَّا يَقُولُونَ، وَقَامَ الْحَجَرُ فَأَخَذَ ثَوْبَهُ فَلَبِسَهُ، وَطَفِقَ بِالْحَجَرِ ضَرْبًا بِعَصَاهُ، فَوَاللَّه إِنَّ بِالْحَجَرِ لَنَدَبًا مِنْ أَثَرِ ضَرْبِهِ ثَلاَثًا أَوْ أَرْبَعًا أَوْ خَمْسًا فَذَلِكَ قَوْلُهُ ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَكُونُوا۟ كَٱلَّذِينَ ءَاذَوْا۟ مُوسَىٰ فَبَرَّأَهُ ٱللَّهُ مِمَّا قَالُوا۟ وَكَانَ عِندَ ٱللَّهِ وَجِيهًا ﴿٦٩﴾﴾[1].

**چیرۆکی بیستو چوارەم: ئەو بەردەی پۆشاکەکەی پێغەمبەر موسا (عليه السلام) ی ڕفاند**

هاوەڵی خۆشەویست ئەبو هورەیرە (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: بەڕاستی پێغەمبەر موسا (عليه السلام) پیاوێکی شەرمنو شاراوە بوو، هیچ کات لاشەی بەڕووتی نەدەبینرا چونکە شەرمی لێیان دەکرد، هەندێك لە ئازاردەران لە بەنی ئیسرائیلیەکان ئازاریان دەدا، ووتیان: ئەم شاردنەوەیەی موسا (عليه السلام) ئیللا عەیبێك لە پێستو لاشەیدا هەیە، جا یان نەخۆشی بەڵەکی هەیە، وەیان هێلکەی گونی

---

(١) أَخرَجَه البُخَارِيُّ (٣٤٠٤).

ئاوساوە، وە یان بەڵاو نەهامەتییەکی هەیە، وە خوای گەورەش دەیویست کە لەو تۆمەتو بوختانانە پاکی بکاتەوە کە بە موسا(عليه السلام) دەووترا، رۆژێکیان بەتەنها بوو پۆشاکەکەی لەسەر بەردێك داناو پاشان خۆی شۆری، وەکاتێك لە خۆشۆردن بووەوە ویستی پۆشاکەکەی ببات‌و لەبەری بکات، بەڵام بەردەکە بە خێرایی رۆیشت، وە موسا (عليه السلام) بە دارەکەیەوە دوای کەوت‌و لە بەردەکەی دەداو دەیفەرموو: ئەی بەرد بوەستە پۆشاکەکانم پۆشاکەکانم، تاکو گەیشتە لای کۆمەڵێك لە بەنی ئیسرائیلیەکان (ئەوانەی کە بوختانیان بۆ کرد بوو بەوەی کە لاشەی عەیبێکی هەیە)، پاشان کە لاشەیان بەڕوتی بینی کە خوای گەورە لە جوانترین شێوە دروستی کردووەو بەری کرد لەو تۆمەت‌و بوختانانەی کە بۆیان هەڵبەستبوو، ئینجا بەردەکە وەستاو موسا (عليه السلام) پۆشاکەکەی بردو لەبەری کردو ئینجا بە دارەکەی لە بەردەکەی دەدا، پاشان فەرمووی: سوێند بەخوا شوێنەوارو شوێن لێدانی دارەکە بە بەردەکەوە دیارە، سیان یان چوار یان پێنج، خوای پەروەردگاریش دەفەرموێت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَكُونُواْ كَٱلَّذِينَ ءَاذَوۡاْ مُوسَىٰ فَبَرَّأَهُ ٱللَّهُ مِمَّا قَالُواْۚ وَكَانَ عِندَ ٱللَّهِ وَجِيهٗا ﴿٦٩﴾ ﴾ پەروەردگاریش فەرموویەتی: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە، وەکو ئەوانە مەبن کە ئازاری موسایان دا، پەروەردگار لەو تۆمەت‌و بوختانانە پاراستی‌و پاکی کردەوە، ئەو لای خوا زۆر بەڕێزو خاوەن پلەیە .

**چەند سوودو ئامۆژگارییەك لەم چیرۆکەدا.**

(١) لە شەریعەتی پێغەمبەر موسادا (عليه السلام) ڕێگە پێدراو بووە پیاوان بە ڕوتی خۆیان بشۆرن، بەڵام شەریعەتی ئێمە ئەوەی لابردووەو نەسخی کردوەتەوە.

(٢) فەزڵو گەورەیی پێغەمبەر موسا (عليه السلام) وە شەرمکردنی لەوەی کە بە ڕووتی خۆ بشۆرێت، هەرچەندە ڕێگە پێدراویش بووە .

(٣) پێویستە مرۆڤی باوەڕدار بەشەرم بێت، بە تایبەتی لە بەرامبەر پەروەردگاردا، شەرمکردنێك کە شایەن بێت بەرامبەر بە پەروەردگار .

(٤) شەرم کردن ڕێگەیەکە بەرەو بەهەشت .

(٥) مرۆڤی باوەڕداری شەرمن لای پەروەردگار خۆشەویستە .

(٦) پێویستە هەر کات مرۆڤی باوەڕدار خۆی شۆری لە شوێنکی داپۆشراودا خۆی بشۆرێت، بۆ ئەوەی هیچ کەس نەی بینێت .

(٧) پێغەمبەران (عَلَيْهِم الْصلاةُ السَّلاَم) لە هەموو کەمو کوڕییەك بەرینو پەروەردگار هەڵی بژاردوون، کاتێك بەنی ئیسرائیل لاشەیان بەڕوتی بینی، جوانترین شێوەی هەبوو، دڵنیابوون لەوەی کە بەهەڵەدا چوونە.

(٨) تەنانەت پێغەمبەرانیش (عَلَيْهِم الْصلاةُ السَّلاَم) لە ئازاردانی نەزانەکان ڕزگاریان نەبووە، بەڵام ئەوان ئارامگر بوونە لەسەر ئەو ئازاردانە .

(٩) چەند موعجزەیەکی پێغەمبەر موسا (عليه السلام) لەوانە: ڕۆیشتنو ڕاکردنی بەرد، شوێنەوارو دەرکەوتنی شوێن دارەکان لەسەر بەردەکە .

**القِصَّةُ الخَامِسَةُ وَالعِشْرُونَ: حَبْسُ الشَّمْسِ لِنَبِيٍّ مِنْ الأَنْبِيَاء (عليه السلام)**

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ(رضي الله عنه) قَالَ قَالَ: رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) غَزَا نَبِيٌّ مِنَ الأَنْبِيَاء فَقَالَ لِقَوْمِه لاَ يَتْبَعْنِي رَجُلٌ قَدْ مَلَكَ بُضْعَ امْرَأَة وَهُوَ يُرِيدُ أَنْ يَبْنِيَ بِهَا وَلَمَّا يَبْنِ وَلاَ آخَرُ قَدْ بَنَى بُنْيَانًا وَلَمَّا يَرْفَعْ سُقُفَهَا وَلاَ آخَرُ قَد اشْتَرَى غَنَمًا أَوْ خَلِفَات وَهُوَ مُنْتَظِرٌ وِلاَدَهَا قَالَ: فَغَزَا فَأَدْنَى لِلْقَرْيَةِ حِينَ صَلاَةَ الْعَصْرِ أَوْ قَرِيبًا مِنْ ذَلِكَ فَقَالَ لِلشَّمْسِ أَنْت مَأْمُورَةٌ وَأَنَا مَأْمُورٌ اللَّهُمَّ احْبِسْهَا عَلَيَّ شَيْئًا فَحُبِسَتْ عَلَيْه حَتَّى فَتَحَ اللَّهُ عَلَيْه قَالَ: فَجَمَعُوا مَا غَنِمُوا فَأَقْبَلَت النَّارُ لِتَأْكُلَهُ فَأَبَتْ أَنْ تَطْعَمَهُ فَقَالَ فِيكُمْ غُلُولٌ فَلْيُبَايِعْنِي مِنْ كُلِّ قَبِيلَة رَجُلٌ فَبَايَعُوهُ فَلَصِقَتْ يَدُ رَجُلٍ بِيَده فَقَالَ فِيكُمُ الْغُلُولُ فَلْتُبَايِعْنِي قَبِيلَتُكَ فَبَايَعَتْهُ قَالَ فَلَصِقَتْ بِيَد رَجُلَيْنِ أَوْ ثَلاَثَة فَقَالَ فِيكُمُ الْغُلُولُ أَنْتُمْ غَلَلْتُمْ قَالَ فَأَخْرَجُوا لَهُ مِثْلَ رَأْسِ بَقَرَة مِنْ ذَهَب قَالَ فَوَضَعُوهُ فِي الْمَالِ وَهُوَ بِالصَّعِيد فَأَقْبَلَت النَّارُ فَأَكَلَتْهُ فَلَمْ تَحِلَّ الْغَنَائِمُ لأَحَد مِنْ قَبْلِنَا ذَلِكَ بِأَنَّ اللَّهَ تَبَارَكَ وَتَعَالَى رَأَى ضَعْفَنَا وَعَجْزَنَا فَطَيَّبَهَا لَنَا )[1] .

**چیرۆکی بیستوپێنجەم: ڕاگرتنی خۆر بۆ یەکێك لە پێغەمبەران (عليه السلام)**

هاوەڵی خۆشەویست ئەبو هورەیرە (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمووێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: پێغەمبەرێك لە پێغەمبەران غەزایەکی کرد، وە بە ئوممەتەکەی فەرموو: با پیاوێك شوێنم نەکەوێت کە ئافرەتێکی مارەکردبێت و ویستبێتی بیگوێزێتەوەو هێشتا نەیگواستبێتەوە، هەروەها کەسێکی تریش کە خانوویەکی

---

(١) أخرجه البُخاريُّ (٣١٢٤)، ومُسْلِمٌ (٤٥٣٠) .

دروستکردبێت و هێشتا سەری نەگرتبێ، وە یەکێکی تریش کە مەڕ یان ووشتری ئاوسی کڕی بێ و چاوەڕێی بەچکەی ببێ و بزێت، ئینجا پێغەمبەرەکە غەزاکەی کردوو پاشان نزیك گوندێك بووە، کاتی نوێژی عەسر یان دەوروبەری عەسر، پێغەمبەرەکە بە خۆری فەرموو: تۆ فەرمان بەرداری و منیش فەرمان بەردارم، خوایە بۆ ماوەیەك ئەم خۆرە ڕاگرە بۆم، وە خۆرەکەی بۆ ڕاگیرا تاکو خوای گەورە سەری خست، ئینجا دەست کەوتە جەنگییەکانیان کۆکردەوە، پاشان ئاگر هات بۆ ئەوەی کە دەست کەوتەکان بسوتێنێت، بەڵام نەی سوتاند، پێغەمبەرەکەش فەرمووی: دزتان تێدایە، با لە هەر هۆزێك پیاوێك پەیمانم بداتێ، ئینجا پەیمانیان دایەو دەستی پیاوێك بەدەستییەوە لکا (بەدەستییەوە نوسا)، پێغەمبەرەکەش فەرمووی: دزتان تێدایە، با هۆزەکەت هەموویان پەیمانم بدەنێ، وە هۆزەکەی هەموویان پەیمانیان دایەو ئەمجارەیان دەستی پێغەمبەرەکە لکا بەدەستی دوو یان سێ پیاوی هۆزەکەیەوە، پاشان پێغەمبەرەکە فەرمووی: دەزەکە لەناو ئێوەدایەو ئێوە دزیتان کردووە، ئینجا بە ئەندازەی سەرە مانگایەك ئاڵتونیان بۆ دەرهێناو خستیانەوە ناو دەستکەوتەکان کە لە دەشتەکەدا دانرابوو، ئەمجارەیان ئاگرەکە هات و سوتاندی، دەستکەوتەکانی شەڕ بۆکەس حەڵاڵ نەکراوە لەپێش ئێمەدا، بەڵام چونکە خوای گەورە ئێمەی بە لاوازی و بێ دەسەڵاتی بینیوە، بۆیە دەستکەوتی شەڕی بۆ حەڵاڵ کردووین .

**چەند سوودو ئامۆژگارییەك لەم چیرۆکەدا.**

(١) غەزاو جەنگ لەسەر نەتەوەکانی پێش ئێمەش فەرز بووە .

(٢) لە چیرۆکەکەدا بەڵگەی ئەوەی تێدایە کە نابێت کە سانێك بچن بۆ غەزاو جەنگ لەکاتێکدا سەرقاڵن بە ژن هێنان یان خانوو دروست کردن .

(٣) خۆشویستنی دونیا هۆکارە بۆرێگری لە غەزاو جیا بوونەوە لە موسڵمان.

(٤) نیشانەو موعجیزەی گەورە لەسەر دەسەڵاتی خوای گەورە، هەروەها پشتگیری کردنی نێر دراوەکانیو یارمەتیدانیان، لەسەر ئەو کارە گرنگانەی خراوەتە ئەستۆیان، لەوانە: ڕاگرتنی خۆر تاکو بەسەر دوژمندا سەر دەکەون.

(٥) لە ئوممەتانی پێش ئێمەدا دەستکەوتی غەزاو جەنگ حەڵاڵ نەبووە، بۆیە کاتێك دەستکەوتیان هەبووایە ئەوا کۆیان دەکردەوەو ئاگرێك دەهاتو دەیسوتاند، بەڵام بۆ ئەم ئوممەتە حەڵاڵەو ڕەوایە .

(٦) لە ئوممەتانی پێشودا پیاو چاك هەبووە کە لە پێناوی خوادا جەنگاون، وە خوای گەورە لەسەر دەستی ئەوان سەر کەوتن بەدەست دەخات .

(٧) بەهۆی کرداری نەفامەوە سزای خوای گەورە کۆمەڵێك دەگرێتەوە .

(٨) هەرچەندە ئەو پێغەمبەرە سوپاکەی پاك کردبووە لەوانەی دەبنە هۆی شکاندنی سوپا، بەڵام هەر کۆمەڵێك باوەڕ لاوازی تێدا مابوو، ئەوانیش ئەوانە بوون کە دزی یان لە دەست کەوتی جەنگ کرد بوو .

## الْقِصَّةُ السَّادِسَةُ وَالْعِشْرُونَ: الْقَوْمُ الَّذِي أَحْيَا اللَّهُ لَهُمْ مَيِّتًا

عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (رضي الله عنه) قَالَ قَالَ: رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) حَدِّثُوا عَنْ بَنِي إِسْرَائِيلَ وَلاَ حَرَجَ، فَإِنه كَانَتْ فِيهِم الأَعَاجِيب، ثُمَّ أَنْشَأَ يُحَدِّث قَالَ: خَرَجَتْ طائفة مِنْ بَنِي إِسْرَائِيل حَتى أَتَوا مَقْبَرَة لَهُم مِنْ مَقَابِرِهِمْ، فَقَالُوا: لَوصَلَّيْنَا رَكْعَتَيْن، وَدَعَوْنَا اللَّه عَزَّ وَجَلَّ أَنْ يُخْرِج لَنَا رَجُلاً مِمَّنْ قَدْ مَاتَ نَسْأَلهُ عَنْ الْمَوْت، قَالَ: فَفَعَلُوا فَبَيْنَمَا هُمْ كَذَلِكَ إِذْ طَلَعَ رَجُل رَأْسه مِنْ قَبْر مِنْ تِلْكَ الْمَقَابِر خلاَسِي بَيْن عَيْنَيْه أَثَر السُّجُود، فَقَالَ: يَا هَؤُلاَء مَا أَرَدْتُمْ إِلَيّ فَقَدْ مِتُّ مُنْذ مَائَة سَنَة، فَمَا سَكَنت عَنِّي حَرَارَةُ الْمَوت حَتَى كَان الآن فَادعُوا اللَّه عَزَّ وَجَلَّ لِي يعيدُنِي كَمَا كنتُ)[1] .

## چیرۆکی بیستو شەشەم: ئەو قەومەی خوای گەورە مردو یەکی بۆ زیندو کردنەوە

هاوەڵی خۆشەویست جابری کوڕی عەبدوڵلا (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: لە بەنی ئیسرائیلەوە شت بگێڕنەوە، چونکە لەناو ئەواندا شتی زۆر سەر سوڕهێنەر هەیە، جارێکیان کۆمەڵێك لە بەنی ئیسڕائیل چوون بۆ گۆڕستانێك لە گۆڕستانەکانیانو ووتیان: با دوو ڕکات نوێژ بکەینو داوا لە خوای گەورە بکەین کە یەکێك لە پیاوە مردووەکانی ئەم گۆڕستانەمان بۆ زیندو بکاتەوەو بێنێتەدەر تاکو پرسیاری لێ بکەین سەبارەت بە مردن، پاشان دووڕکاتە نوێژەکەیان کردوو ئەوەندەی پێنەچوو لە یەکێك لە گۆڕەکان پیاوێکی ڕەنگ ئەسمەر سەری لەناو

(١) (صَحِيح) أَخرَجَه أَحْمَد وَصَحَّحَهُ الشَّيْخ الأَلْبَانِي فِي سِلسِلَة الأَحَادِيث الصَّحِيحَة (٢٩٢٦).

گۆڕەکەی دەرکرد، وە پیاوەکە شوێنەواری سوجدە بردن بە ناو چەوانییەوە دیار بوو، وە پیاوە مردووەکە بە بەنی ئیسرائیلیەکانی ووت: ئێوە چ کارێکتان بەمن هەیە؟ من ماوەی سەد ساڵ دەبێت مردووم، وە تاکو ئێستا لاشەم سارد نەبۆتەوە لە گەرمی مردنو ڕۆح کێشان، بپاڕێنەوە لە خوای گەورە با بم گێڕێتەوە شوێنی خۆم .

## چەند سوودو ئامۆژگارییەك لەم چیرۆکەدا.

(١) دروستە گێڕانەوەی چیرۆکەکانی بەنی ئیسرائیل بەمەرجێك دڵنیابیت لەوەی کە هەڵبەستراوو درۆ نییە .

(٢) چەسپاندنی کەراماتی پیاو چاکان ڕاستەو خوای پەروەردگار بە هەندێك لەبەندەکانی خۆی دەبەخشێت .

(٣) نوێژ هۆکارێکی سەرەکیە بۆ ڕزگاربوون لە ناخۆشیو گیرابوونی پاڕانەوە .

(٤) ناڕەحەتی ئازاری گیان کێشانو مانەوەی دوای سەد ساڵ .

(٥) کارێکی ڕێگە پێ دراوە ئەگەر کەسێك بپاڕێتەوە لە خوای گەورە بۆ شتێکی گەورە (لە توانای مرۆڤدا نەبێت)، وە پێش پاڕانەوەکەی دوو ڕکاعەت نوێژ بکات .

## القِصَّة السَّابِعَة وَالعِشْرُون: وَصِيَّة نُوح (عليه السلام) لابْنِه

عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو (رضي الله عنه) قَالَ: قَالَ: رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) إِنَّ نَبِيَّ اللَّهِ نُوحاً (عليه السلام) لَمَّا حَضَرَتْهُ الْوَفَاةُ، قَالَ لابْنِهِ: إِنِّي قَاصٌّ عَلَيْكَ الْوَصِيَّةَ، آمُرُكَ بِاثْنَتَيْنِ، وَأَنْهَاكَ عَنِ اثْنَتَيْنِ، آمُرُكَ بِـ (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ)، فَإِنَّ السَّمَوَاتِ السَّبْعَ، وَالأَرْضِينَ السَّبْعَ، لَوْ وُضِعَتْ فِي كَفَّةٍ، وَوُضِعَتْ (لا إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ) فِي كَفَّةٍ، رَجَحَتْ بِهِنَّ (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ)، وَلَوْ أَنَّ السَّمَوَاتِ السَّبْعَ، وَالأَرْضِينَ السَّبْعَ، كُنَّ حَلْقَةً مُبْهَمَةً قَصَمَتْهُنَّ (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ)، وَ(سُبْحَانَ اللَّهِ وَبِحَمْدِهِ)، فَإِنَّهَا صَلاَةُ كُلِّ شَيْءٍ، وَبِهَا يُرْزَقُ الْخَلْقُ، وَأَنْهَاكَ عَنِ الشِّرْكِ وَالْكِبْرِ، قَالَ: قُلْتُ، أَوَقِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، هَذَا الشِّرْكُ قَدْ عَرَفْنَاهُ، فَمَا الْكِبْرُ؟ قَالَ: أَنْ يَكُونَ لأَحَدِنَا نَعْلاَنِ حَسَنَتَانِ لَهُمَا شِرَاكَانِ حَسَنَانِ؟ قَالَ: « لاَ » قَالَ هُوَ أَنْ يَكُونَ لأَحَدِنَا حُلَّةٌ يَلْبَسُهَا؟ قَالَ: « لاَ » قَالَ: الْكِبْرُ هُوَ أَنْ يَكُونَ لأَحَدِنَا دَابَّةٌ يَرْكَبُهَا قَالَ: « لاَ » قَالَ: أَفَهُوَ أَنْ يَكُونَ لأَحَدِنَا أَصْحَابٌ يَجْلِسُونَ إِلَيْهِ؟ قَالَ: «لاَ» قِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَمَا الْكِبْرُ؟ قَالَ: سَفَهُ الْحَقِّ، وَغَمْصُ النَّاسِ )[١] .

## چیرۆکی بیستو حەوتەم: وەسیّتی پێغەمبەر نوح (عليه السلام) بۆ کوڕەکەی

هاوەڵی خۆشەویست عەبدوڵلای کوڕی عەمر (خوایان لێ ڕازی بێت) دەفەرمووێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: لە کاتێکدا پێغەمبەر نوح (عليه السلام) مردنی نزیک بووەوە، بە کوڕەکەی فەرموو: من وەسیەتت بۆ دەکەم، فەرمانت

---

(١) (صَحِيح) أَخْرَجَه الْبُخَارِيُّ فِي الأَدَب الْمفْرَد وَصَحَّحَهُ الشَّيْخ الأَلْبَانِي فِي سِلسِلة الأَحَادِيث الصَّحِيحَة (١٣٤) .

پێدەکەم بە دووشت، وە ڕێگریت لێدەکەم لە دووشت، فەرمانت پێدەکەم بە ووتنی: (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ) واتە: هیچ پەرستراوێك نییە بەحەق جگە لە (الله) چونکە هەر حەوت ئاسمانەکانو زەوییەکانیش، ئەگەر بخرێنە تایەکی تەرازووەوەو(لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ) لە تایەکەی تری بێت، ئەوا (لاَ إِلَـهَ إِلاَّ اللَّـهُ) قورسترە، وە ئەگەر هەر حەوت ئاسمانەکانو زەوییەکانیش ببن بە بازنەیەکی نادیارو ئالۆز ئەوا (لاَ إِلَـهَ إِلاَّ اللَّـهُ) لێکیان جیادەکاتەوە، وە فەرمانیشت پێدەکەم بە ووتنی: (سُـبْحَانَ اللَّـهِ وَبِحَمْـدِهِ)، واتە: پاکیو بێگەردیو ستایش بۆ خوایە، چونکە ووتنی ئەم ووشانە نوێژی هەموو شتێکە، وە بەهۆیەوە ڕزقو ڕۆزی دەبەخشرێت بە دروستکراوەکان، وە ڕێگریشت لێدەکەم لە هاوبەش دانان بۆ خوای گەورە، وە لە خۆبەگەورەزانین، هاوەڵەکان فەرموویان: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) زانیومانە هاوبەش دانان بۆ خوای گەورە چییە، بەڵام خۆبەگەورە زانین چییە؟ ووتیان: ئەوەیە کە یەکێك لە ئێمە جوتێك نەعل یان پێڵاوێکی جوانی هەبێتو قەیتانی جوانی پێوەبێت، ئەویش فەرمووی: نەخێر، ووتیان: یەکێك لەئێمە پۆشاکێکی جوانی هەبێتو لەبەری بکات، ئەویش فەرمووی: نەخێر، ووتیان: ئەوەیە کە یەکێك لە ئێمە سوارییەکی هەبێتو سواری بێت، ئەویش فەرمووی: نەخێر، ووتیان: ئایا ئەوەیە کە یەکێك لەئێمە هاوڕێی هەبێتو لەلای دابنیشن، ئەویش فەرمووی: نەخێر، ووتیان: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەی خۆبەگەورە زانین چییە؟ ئەویش فەرمووی: وەرنەگرتنو ڕەتکردنەوەی حەقو ڕاستیە، وە بەسوكو نزم تەماشا کردنی خەڵکە .

**چەند سوودو ئامۆژگارییەك لەم چیرۆکەدا.**

١) پێویستە باوەڕدار لەکاتی مردنیدا وەسیەتو ئامۆژگاری بۆ منداڵو خێزانو کەسو کاری بکات .

٢) زەوییەکانیش حەوتن، وەکو ئاسمانەکان، خوای گەورەدەفەرمووێت:

﴿ ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَ سَبْعَ سَمَٰوَٰتٍ وَمِنَ ٱلْأَرْضِ مِثْلَهُنَّ ﴿١٢﴾ ﴾ سورة الطلاق .

**واتە :** خوای پەروەردگار ئەو زاتەیە کە حەوت چین ئاسمانی دروستکردووە، وە بەوێنەی ئەوان زەویشی دروست کردووە.

(٣) فەزڵو گەورەیی (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ)، وە بەدڵنیایی تەنها وتنی: هیچ سوود بە بێژەری ناگەیێنێت، ئەگەر حەوت مەرجی لەگەڵدا نەبێت، ئەوانیش:

– زانیاری بەماناکەی لە نەفیو جێگیرکردندا، بۆیە هەرکەسێك بیڵێتو ماناو ناوەڕۆکەکەی نەزانێت ئەوا سوودی پێ ناگەیێنێت .

– دڵنیایی، کەبریتییە لە تەواوێتی زانیاری پێی کە دژی گومان ودوودڵییە .

– نییەت پاکی ودڵسۆزی، کەنەفی هاوبەش بڕیاردان دەکات .

– ڕاستگۆیی کەبەربەستە لە دوو ڕوویی، چونکە دووڕووەکان بەزوبان ئەیڵێنو باوەڕیان بە دەلالەت لەسەر کراوەکان نییە .

– خۆشەویستی بۆ ئەم ووشەیەو ئەوەی کە ئەم وشەیە دەلالەت بکات لەسەری، وە خۆشحاڵ بوون بەم شتە .

– خۆ پەیوەست کردن بە جێ بەجێکردنی مافەکانی، کە بریتییە لە کردەوە فەرزەکان بەنیاز پاکی بۆ خوا .

– وەرگرتن، کەنەفی ڕەتکردنەوە ئەکات، ئەمەیش بە خۆ پەیوەستکردن بە فەرمانەکانی خوای پەروەردگارو وازهێنان لە قەدەغەکراوەکانی ئەبێت .

(٤) فەزڵو گەورەیی زیکرو یادی خوای گەورە .

(٥) تەرازووی ڕۆژی دوایی حەقەو دوو تای هەیە، ئەمیش بیروباوەڕی ئەهلی سوننەو جەماعەیە .

(٦) خۆڕازاندنەوە بە پۆشاکی جوان بریتی نییە لە خۆبەگەورە زانین، بەڵکو کارێکی ڕێگەپێدراوە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ( إِنَّ اللَّهَ جَمِيلٌ، يُحِبُّ الْجَمَال )[1] .

**واتە:** خوای پەروەردگار جوانەو خاوەنی هەموو ناوو سفەتێکی جوانو پیرۆزە، هەروەها هەموو کارەکانی جوانو پڕبایەخو پیرۆزەو جوانی بێ سنورە لە ناوو سیفەتدا، وە ئەوانەی خۆش دەوێت کە خۆیان دەڕازێننەوە بە کارو کردەوەی جوان .

(٧) پێویستە مرۆڤی باوەڕدار خۆی لە خۆبەگەورە زانین بە دووربگرێت، لەبەرئەوەی فەرموودەی زۆر هاتووە سەبارەت بەڕێگریو قەدەغەیی خۆبەگەورە زانین.

---

(١) أخرجه مسلم (٢٧٥)

## القِصَّة الثَّامِنَة وَالعِشْرُون: مُحَاجَّة آدَم وَمُوسَى (عَلَيْهِمَا السَّلَام)

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قال قَالَ: رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) احْتَجَّ آدَمُ وَمُوسَى (عَلَيْهِمَا السَّلَامُ) عِنْدَ رَبِّهِمَا فَحَجَّ آدَمُ مُوسَى قَالَ مُوسَى أَنْتَ آدَمُ الَّذِي خَلَقَكَ اللَّهُ بِيَدِهِ وَنَفَخَ فِيكَ مِنْ رُوحِهِ وَأَسْجَدَ لَكَ مَلَائِكَتَهُ وَأَسْكَنَكَ فِي جَنَّتِهِ ثُمَّ أَهْبَطْتَ النَّاسَ بِخَطِيئَتِكَ إِلَى الأَرْضِ فَقَالَ آدَمُ أَنْتَ مُوسَى الَّذِي اصْطَفَاكَ اللَّهُ بِرِسَالَتِهِ وَبِكَلَامِهِ وَأَعْطَاكَ الأَلْوَاحَ فِيهَا تِبْيَانُ كُلِّ شَيْءٍ وَقَرَّبَكَ نَجِيًّا فَبِكَمْ وَجَدْتَ اللَّهَ كَتَبَ التَّوْرَاةَ قَبْلَ أَنْ أُخْلَقَ قَالَ مُوسَى بِأَرْبَعِينَ عَامًا قَالَ آدَمُ فَهَلْ وَجَدْتَ فِيهَا ﴿وَعَصَىٰٓ ءَادَمُ رَبَّهُۥ فَغَوَىٰ﴾ قَالَ نَعَمْ قَالَ أَفَتَلُومُنِي عَلَى أَنْ عَمِلْتُ عَمَلاً كَتَبَهُ اللَّهُ عَلَيَّ أَنْ أَعْمَلَهُ قَبْلَ أَنْ يَخْلُقَنِي بِأَرْبَعِينَ سَنَةً قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) فَحَجَّ آدَمُ مُوسَى (عَلَيْهِمَا السَّلَامُ)[1].

**چیرۆکی بیستو هەشتەم: بەڵگە هێنانەوە بۆ یەکتری لەنێوان ئادەمو موسا سەلامی خوایان لێبێت**

هاوەڵی خۆشەویست ئەبو هورەیرە (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمووێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ئادەمو موسا کەوتنە گفتوگۆ لە نێوان خۆیاندا لەلای خوای گەورە، وە ئادەم بەڵگەی بەهێزتربوو لە موسا، موسا فەرمووی: تۆ ئادەمی کە خوای گەورە بە دەستی پیرۆزو موبارەکی خۆی دروستی کردووی، وە لە ڕوحی خۆی فووی کرد بە بەرتا، وە مەلائیکەتەکان سوجدەیان بۆبردی، وە جێگیری کردی لە بەهەشتدا، پاشان بەهۆی هەڵەکەت (کەلەدارەکەت خوارد) خەڵکیت دابەزاند بۆسەر زەوی؟

(١) أخرجه البُخاريُّ (٦٦١٤)، ومُسْلِمٌ (٦٦٨٦).

ئادەم فەرمووی: تۆ ئەو موسایەی کە خوای گەورە بەهۆی پەیامو ووشە پیرۆزەکانیەوە هەڵیبژاردووی، وە تەوراتی پێبەخشی کە ڕۆشنکەرەوەی هەموو شتێك بوو، وە نزیکی کردیتەوەو ڕزگاری کردی، وە بوونی تەوراتیش چەندە پێش دروستکردنی من بوو؟ موسا فەرمووی: چل ساڵ، ئادەم فەرمووی: ئەم ئایەتەی تێدابووە: کە خوای گەورە دەفەرمووێت:﴿ وَعَصَىٰٓ ءَادَمُ رَبَّهُۥ فَغَوَىٰ ﴾ سورة طه .

**واتە:** ئادەم یاخی بوو لە پەروەردگاریو فریوی خواردو ڕێگەی لێ تێکچوو، موسا فەرمووی: بەڵێ، ئادەمیش فەرمووی: باشە ئایا سەرزەنشتی من دەکەی لەسەر کردەوەیەك کە پێش چل ساڵ لە دروست بوونم خوای گەورە نوسیویەتی؟ ئینجا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: بەڵگەی ئادەم بەهێزتربوو لە بەڵگەی موسا .

## چەند سوودو ئامۆژگارییەك لەم چیرۆکەدا.

(١) فەزڵو گەورەیی پێغەمبەر ئادەم (عليه السلام) بەوەی خوای گەورە بە دەستی خۆی دروستی کردووە، وە فەرمانی کردووە بە مەلائیکەتەکان سوجدەی ڕێزی بۆ ببەن، هەروەها لە بەهەشتدا دایناوە .

(٢) فەزڵو گەورەیی پێغەمبەر موسا (عليه السلام) بەوەی خوای گەورە قسەی لەگەڵ کردووە، هەروەها ئەو لەو حانەی پێ بەخشیوە کە هەموو شتێکی تێدا ڕوون کراوەتەوە .

(٣) چەسپاندنی دەست بۆ خوای گەورە، وە دروست نییە بۆ هیچ کەسێك نکوڵی لەو ڕاستیە بکات، بەڵام شێوازەکەی چۆنە ئێمە نایزانین، خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌ ۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ ﴿١١﴾﴾ سورة الشورى

**واتە:** هیچ شتێك نییە لە وێنەی ئەو زاتە پیرۆزە، وە هیچ شتێك لەو ناچێت، چونکە پەروەردگارەو بەدیهێنەرە. وە هەر ئەویش بیسەرو بینایە.

(٤) خوای گەورە تەوراتی بەدەستی خۆی نوسیوە پێش دروستکردنی ئادەم بەچل ساڵ وە یەکێك لەو ئایەتانەی کەتێیدایە: ﴿وَعَصَىٰٓ ءَادَمُ رَبَّهُۥ فَغَوَىٰ ﴿١٢١﴾﴾ لە قورئانیشدا هاتووە، هەروەها ئادەمیشی بەدەستی خۆی دروستکردووە .

(٥) خوای گەورە بەهەشتو دۆزەخی دروستکردووە پێش دروستبوونی ئادەم .

(٦) دروستە موناقەشەو گفتوگۆکردن لەسەر باسێك بۆدەرکەوتنی حەقو ڕاستی، ئەویش بە چەند مەرجێك:

– ئەوکەسەی کە موناقەشەو گفتوگۆ دەکات لەسەر ڕوونکردنەوەی حەقو ڕاستی دەبێت نیەت پاك بێت .

– دەبێت ئەوکەسەی کە موناقەشەو گفتوگۆدەکات زانا بێت بەو باسە .

– دەبێت کەسێکی نەرمو نیانو لەسەر خۆبێتو خۆبەگەورە زان نەبێت، بۆ ئەوەی حەقو ڕاستی ڕەت نەکاتەوە .

– دەبێت دڵخۆش بێت بە دەرکەوتنی حەقو ڕاستی، جا لەسەر دەستی خۆی بێت، یان لەسەر دەستی بەرامبەرەکەی بێت .

## القِصَّةُ التَّاسِعَةُ وَالعِشْرُونَ: فَضْلُ تِكْرَارِ التَّوبَةِ وَالاسْتِغْفَارِ

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) فِيمَا يَحْكِي عَنْ رَبِّهِ عَزَّ وَجَلَّ قَالَ: أَذْنَبَ عَبْدٌ ذَنْبًا، فَقَالَ: اللَّهُمَّ! اغْفِرِ لِي ذَنْبِي، فَقَالَ تَبَارَكَ وَتَعَالَى: أَذْنَبَ عَبْدِي ذَنْبًا، فَعَلِمَ أَنَّ لَهُ رَبًّا يَغْفِرُ الذَّنْبَ، وَيَأْخُذُ بِالذَّنْبِ، ثُمَّ عَادَ فَأَذْنَبَ، فَقَالَ: أَيْ رَبِّ اغْفِرْ لِي ذَنْبِي، فَقَالَ تَبَارَكَ وَتَعَالَى: عَبْدِي أَذْنَبَ ذَنْبًا، فَعَلِمَ أَنَّ لَهُ رَبًّا يَغْفِرُ الذَّنْبَ، وَيَأْخُذُ بِالذَّنْبِ، ثُمَّ عَادَ فَأَذْنَبَ، فَقَالَ: أَيْ رَبِّ: اغْفِرْ لِي ذَنْبِي، فَقَالَ تَبَارَكَ وَتَعَالَى: أَذْنَبَ عَبْدِي ذَنْبًا، فَعَلِمَ أَنَّ لَهُ رَبًّا يَغْفِرُ الذَّنْبَ، وَيَأْخُذُ بِالذَّنْبِ، اعْمَلْ مَا شِئْتَ فَقَدْ غَفَرْتُ لَكَ، قَالَ عَبْدُ الأَعْلَى لاَ أَدْرِى أَقَالَ فِى الثَّالِثَةِ أَوِ الرَّابِعَةِ اعْمَلْ مَا شِئْتَ )[1].

**چیرۆکی بیستو نۆیەم: فەزڵی دووبارە بوونەوەی تەویەو داوای لێ خۆشبوون کردن**

هاوەڵی خۆشەویست ئەبو هورەیرە (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرمووێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەوشتانەی کە لە پەروەردگاریەوە دەگێڕێتەوەو دەفەرمووێت: بەندەیەك گوناهێکی ئەنجامداو ووتی: خوایە لە گوناهەکەم خۆشبە، خوای پەروەردگاریش فەرمووی: بەندەکەم گوناهێکی ئەنجامداو پاشان زانی کە پەروەردگارێکی هەیەو لە گوناه خۆش دەبێتو لەسەر گوناهیش بەندەکانی سزادەدات، پاشان دووبارە گوناهێکی تری ئەنجامدایەوەو ووتی: خوایە لەگوناهەکەم خۆشبە، خوای پەروەردگاریش فەرمووی: بەندەکەم گوناهێکی ئەنجامداو پاشان زانی کە پەروەردگارێکی

(١) أخرجه البُخَارِيُّ (٧٥٠٧)، ومُسْلِمٌ (٦٩١٩).

هەیەو لە گوناه خۆش دەبێتو لەسەر گوناهیش بەندەکانی سزادەدات، پاشان سێ بارە گوناهێکی تری ئەنجامدایەوەو ووتی: خوایە لەگوناهەکەم خۆشبە، خوای پەروەردگاریش فەرمووی: بەندەکەم گوناهێکی ئەنجامداو پاشان زانی کە پەروەردگارێکی هەیەو لە گوناه خۆش دەبێتو لەسەر گوناهیش بەندەکانی سزادەدات، خوای پەروەردگار فەرمووی: چی دەکەیت بیکە، ئەوا من لێت خۆش بووم، (عَبْدُ الأَعْلَى) دەفەرمووێت: نازانم لە جاری سێ یەم دابوو یان چوارەم فەرمووی: « چی دەکەیت بیکە » .

**چەند سوودو ئامۆژگارییەك لەم چیرۆکەدا.**

(١) گەورەیی‌و لێخۆشبوونی خوای پەروەردگار بەرامبەر بەبەندەکانی .

(٢) دان پێدانانی مرۆڤەکان بە تاوان‌و گوناهەکانیان .

(٣) ئەگەر بەندەکان تاوان‌و گوناه ئەنجام نەدەن، ئەوا خوای گەورە لەناویان دەباتو گەل‌و قەومێکی تر دێنێت کە گوناهو تاوان ئەنجام بدەن‌و پاشان داوای لێخۆش بوون بکەن‌و خوای گەورەش لێیان خۆش ببێت .

(٤) هەر کەسێك تەوبە بکات لەسەر تاوان‌و گوناهەکانی ئەوا وەك ئەوە وایە کە تاوانی ئەنجام نەدابێت .

(٥) پێویستە مرۆڤی باوەڕدار ئاگادار بێت لەوەی گوێ نەدات بەتاوان‌و هەڵە، چونکە لەوانەیە مردن لە پڕ یەخەی پێبگرێتو بواری تەوبەی نەدات .

**ڕوونکردنەوەیەک**

**پێشەوا** ئیبنول قەییمی جەوزی (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرمووێت: ئەم فەرموودەیە وا ناگەیێنێت کە خوای گەورە ڕێگە بەئەنجامدانی گوناهو تاوان بدات، بەڵکو وادەگەیەنێت کە خوای گەورە لێی دەبوورێت، چونکە بەم شێوەیە گوناهو تاوان دەکاتو پاشان پەشیمان دەبێتەوەو تەوبە دەکات، وە خوای گەورە ئەو بەندەیەی تایبەت کردووە بە لێبووردن، چونکە زانیویەتی کە سور نابێت لەسەر گوناهو تاوان، بەڵکو هەرکاتێك توشی گوناهێك هات بەپەلە تەوبە دەکات، وە ئەم حوکمەش گشتیەو هەمووکەسێك دەگرێتەوە کە بەم شێوەیەبێت، بەڵام ئەو بەندەیە لێبووردنی بۆ بڕاوەتەوە، هەروەك هاوەڵانی بەدر، وە بەهەمان شێوە ئەو هاوەڵانەی کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) مژدەی بەهەشتی پێداون، یان پێیانی ڕاگەیاندووە کە خوای گەورە لێیان خۆش بووە، جا ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە ڕێگەی پێدابن گوناهو تاوان ئەنجام بدەنو واز لە بەندایەتیو کارە واجبەکان بهێنن، بەڵکو ئەم هاوەڵانە دوای ئەوەی مژدەی لێبوردنیان پێدرا زیاتر لە خوای گەورە دەترسانو بەندایەتیان بۆ دەکرد، هەروەك ئەو (١٠) هاوەڵەی کە مژدەی بەهەشتیان پێدرابوو[1] .

---

(١) بڕوانە: الفوائد (ص: ١٥) .

**لەکۆتاییدا...**

سوپاس‌و ستایش بۆ خوای پەروەردگار کەیارمەتی دام بۆ ئامادەکردنی ئەم بابەتە، وە هەموو ئەو برایانەی کە یارمەتی دەرم بوون.

**برای خۆشەویست... خوشکی بەڕێز...**

ئەگەر هەرشتێك لەم پەرتوکەی بەردەستدایە لەڕاستی‌و ڕەواو حەق ئەوا لەخوای تاکو تەنهاو پێغەمبەرەکەیەوەیە، وە هەرشتێکیش لە هەڵەو بیرچوون‌و خامۆش کردنی تێدا بێت، ئەوا لەخۆم‌و لە شەیتانەوەیە... خوای پەروەردگارو پێغەمبەرەکەی(ﷺ) بەرین لێی...

وە جێی خۆیەتی لێرەشەوە سوپاس‌و پێزانینی خۆم ئاراستەی مامۆستای بەڕێز (م. صَلاح الدِّين عَبْدُ الْكَرِيم) بکەم کە توانی بۆ چاپی دووەمیش ئەرکی پێداچونەوەو هەڵسەنگاندنی شەرعی ئەم پەرتوکە بگرێتە ئەستۆی خۆی، خوای پەروەردگار پاداشتی خەیری بداتەوە.

✍. **أبوبكرأحمد قادر ( ١٤٣١ ) كۆچی .**

اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُك أَنْ تَجْعَلَهُ خَالِصًا لِوَجْهِك الْكَرِيمِ وَتَعْفُوَ عَمَّا وَقَعَ فِيهِ مِنْ الْخَطَأ وَالزَّلَلِ إِنَّك عَفُوٌّ غَفُورٌ رَحِيمٌ، رَبَّنَا تَقَبَّلْ مِنَّا إِنَّك أَنْتَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ، وَاغْفِرْ لِي وَلِوَالِدَيَّ وَلِسَائِرِ الْمُسْلِمِينَ

وَصَلَّى اللَّهُ تَعَالَى عَلَى خَيْرِ خَلْقِهِ مُحَمَّدٍ وَآلِهِ وَأَصْحَابِهِ أَجْمَعِينَ .

وَآخِرُ دَعْوَانَا أَنِ الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ .

# گرنگترین سەرچاوەکان

(١) الْقُرآن الْكَرِيم .
(٢) مُخْتَصَر تَفْسِيْر ابْن كَثِير .
(٣) تَفْسِيْر السَّعْدِي .
(٤) صَحِيح الْبُخَارِيّ .
(٥) صَحِيح مُسْلِم .
(٦) صَحِيح سُنَن أَبِي دَاوُد/ تَحْقِيق الشَّيْخ الْعَلاَّمَة: مُحَمَّد نَاصر الدِّين الأَلْبَانِي(رَحِمَهُ اللّه)
(٧) صَحِيح سُنَن التِّرْمِذِيّ/ تَحْقِيق الشَّيْخ الْعَلاَّمَة: مُحَمَّد نَاصر الدِّين الأَلْبَانِي(رَحِمَهُ اللّه)
(٨) صَحِيح سُنَن ابن مَاجَه/ تَحْقِيق الشَّيْخ الْعَلاَّمَة: مُحَمَّد نَاصر الدِّين الأَلْبَانِي(رَحِمَهُ اللّه)
(٩) صَحِيح سُنَن النَسائِي/ تَحْقِيق الشَّيْخ الْعَلاَّمَة: مُحَمَّد نَاصر الدِّين الأَلْبَانِي(رَحِمَهُ اللّه)
(١٠) صَحِيح الْجَامِع الصَّغِير/ لِلشَّيْخ الْعَلاَّمَة: مُحَمَّد نَاصر الدِّين الأَلْبَانِي(رَحِمَهُ اللّه)
(١١) شَرْح رِيَاض الصَّالحِينَ/ لِلشَّيْخ الْعَلاَّمَة: مُحَمَّد بن صَالِح الْعُثَيمين (رَحِمَهُ اللّه) .
(١٢) صَحِيح الأَدَب الْمُفْرَد لِلإمَام الْبُخَارِيُّ/ تَحْقِيق الشَّيْخ الْعَلاَّمَة: مُحَمَّد نَاصر الدِّين الأَلْبَانِي.
(١٣) فَتْح الْبَارِي شَرْح صَحِيح الْبُخَارِيّ/ لِلْحَافظ: أَحمد ابْن حَجَر الْعَسْقَلانِيّ(رَحِمَهُ اللّه)
(١٤) شَرْح النَّوَوِيّ عَلى مُسْلِم/للشَّيْخ الإمَام الْعَلامَة: أَبُو زَكَرِيَّا يَحْيَى بنُ شَرَف النَّوَوِيّ(رَحِمَهُ اللّه).
(١٥) چەند سەرچاوەیەکە تر .

## ناوەڕۆك


پێشەکی .......... ٣

ئەو پیاوەی سەد کەسی کوشتبوو .......... ٥

ئەو پیاوەی پەروەردگار چاو پۆشی لێکرد .......... ٩

ئەو سێ کەسەی چوونە ناو ئەشکەوتەکەوە .......... ١٤

ئەوپیاوەی فەرمانیکرد بە منداڵەکانی لاشەی بسوتێنن .......... ١٩

لاوێکی باوەڕدار لەگەڵ پادشایەکی بێ باوەڕ.......... ٢٣

ئەو پیاوەی چووە بەهەشتەوە لەبەر ئەوەی سەگێکی تێر ئاوکرد. ٣١

بەڵەکێك‌و کەچەڵێك و کوێرێك ئەوانەی تاقیکرانەوە .......... ٣٤

ئەو پیاوەی زەوییەکی کڕی‌و لەزەوییەکەدا گۆزەیەك ئاڵتونی ..... ٤٠

ئەو پیاوەی هەزار دیناری بە قەرز وەرگرت .......... ٤٣

ئەو هەورەی فەرمانی پێکرا باخی پیاوێك ئاوبدات .......... ٤٦

جورەیجی خوا پەرست .......... ٥٠

ئەو پیاوەی چووە بەهەشتەوە بەهۆی لابردنی ناڕەحەتی لەسەر ڕێگە ٥٤

ئەو پێغەمبەرەی شارە مێرولەیەکی سوتاند.......... ٥٦

پیرە ژنەکەی بەنی ئیسرائیل .......... ٦٠

ئەو ئافرەتەی دوو پێی داری بۆ خۆی دروستکرد .......... ٦٣

ئەو پێشەوایەی لە فەرمان ڕەوایی هەڵات .......... ٦٥

ئەو پیاوەی لەبەر ئازار خۆی کوشت .......... ٦٩

ئەو ئافرەتەی بەهۆی پشیلەیەکەوە چووە ئەگرەوە .......... ٧٠

ئەو خێرمەندەی خێرەکەی لە شوێنی خۆیدا نەبوو .......... ٧١

ئەو پیاوەی پەروەردگار خۆشی دەویست .................................. ٧٤
ئەو پیاوەی شانازی دەکرد بەباو باپیرە بێ باوەڕەکانی .............. ٧٦
ئەو پیاوەی لە جیاتی خوای گەورە بڕیاری دا ......................... ٧٨
پێغەمبەر موسا (عليه السلام) وە مەلائیکەی گیان کێشان .................. ٨١
ئەو بەردەی پۆشاکەکەی پێغەمبەر موسا (عليه السلام) ی ڕفاند .......... ٨٥
ڕاگرتنی خۆر بۆ یەکێك لە پێغەمبەران (عليه السلام) ....................... ٨٨
ئەو قەومەی خوای گەورە مردو یەکی بۆ زیندو کردنەوە ........... ٩١
ئامۆژگاری پێغەمبەر نوح (عليه السلام) بۆ کوڕەکەی ........................... ٩٣
بەڵگە هێنانەوە بۆ یەکتری لەنێوان ئادەم و موسا سەلامی خوایان لێبێت ..... ٩٧
فەزڵی دووبارە بوونەوەی تەوبەو داوای لێ خۆشبوون کردن ........ ١٠٠
سەرچاوەکان .................................................. ١٠٤
ناوەڕۆك .................................................. ١٠٥